# شەشی کانوون یادو پاڵەوانیێتی و سەرکەوتن

گەلی عیراقی مەزنمان بە کوردو عەرەب و کەمایەتیەکانیەوە بەوپەڕی دلسۆزی و خۆشەویستی و شانازی یەوە یادی پیرۆزی دامەزراندنی سوپای گەورەمان ئەکاتەوە ، سوپای سەرکەوتوو . . شواری بەرزی گەلی عیراق .

عیراقیەکان بەو پەڕی شانازی یەوە یادی ئەم رۆژە پیرۆزە ئەکەنەوە . . یادی دامەزراندنی سوپای مەزن کە سەرگوزشتەی ژیانی لە سەرەتاوە تا ئەمڕۆ پڕە لە قارەمانیەتی و رابووردووی پرشنگدار . . لە دژایەتی کردن بەرامبەر بە ئیمپریالیزم، لەپێناوی مافە رەواکانی گەلی عیراقدا .

لەم جەنگە رەوایەماندا کەواپێ ئەناوەتە ساڵی چوارەمین . . سوپای مەزن و نەبەزمان بەرزترین قارەمانیەتی و لێهاتوویی ئەنوێنێ دژی رژێمی خومەینی . . لەپێناوی خاک و ئابڕوو مافی گەلەکەمان .

سەرکەوتنە مەزنەکانی سوپاکەمان لە حاجی ئومەران و پێنجوێن و خوارووی وولاتدا . . بەڵگەی گەورەیە بۆ گەورەیی و پڕشانازی سوپاکەمان .

سوپاکەمان بە پشتیوانی گەلی عیراقی مەزن بە کوردو عەرەبەوە لە ژێر ئاڵای شەکاوەی سەرکردەی قارەمان صدام حسین لە سەرکەوتنێکەوە بەرەو سەرکەوتنێکی تر ئەڕوات . سەرکەوتوو بێ سوپای نەبەزمان بە سەرکردایەتی پێشرەوی گەل صدام حسین . .

نەمری بۆ شەهیدانی سوپاو گەل . .

سەرکەوتن هەر بۆ عیراقی خۆشەویستە .

—رۆشنبیری نوێ—


رۆشـــــنبیری نـــوێ
گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتی مانگانەیە
دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات

سەر نووسەر
مصلح مصطفی جەلالی




داخۆبیستیبتتان یان بەسەر خۆتانا هاتبێت یان لە کەستان پرسێبیت نرخی گیان چەندە ،

وەکوئەوەی یەکێ لەتوبپرسێت ، گیانت بەچەنئەفروشیت ، تاکو من ئێستا-نرخەکەی بدەمو گیانتبکێشم ، چەنو چۆنی پێناوێ ، چەندتئەوی بیدەمو ئیستە لێرەدا گوللەیێك بنێم بەسەردڵتەوە . . . بەمێشکتەوە ، .

جائەگەر شتیوات نەدیوەو نەبیستوە وەبەسەریشتا نەهاتوە ، ئیستە بیری لێبکەرەوەو ، بێریە پێش چاوت تابۆت دەرکەوێ گیان چەن شیرینەو ، چۆن ناکرێت نرخێ بۆگیان دانرێت ، وەهیچ سەرمایەێك نیە بتوانێ بەرابەری بکات لەگەڵ گیانا ، دەرئەکەوێ کەنرخی گیان چەنگرانەو گیان فرۆشتنیش چەنسەختە ، بەڵام برێجار لای برێکەس ، یان روونتربڵێین لای مەردی بەشەرەف ، لای رۆڵەی گۆرەپانی مەردایەتی ، ئەم سەوداو مامەڵەیە ، وەئەم کرنیوفرۆشتنە شێوەیێکی تر پەیائەکات ، واتە لەبەرابەری لنگەترازوی گیانا پارەدانانێن ، بەڵکو کارەکە پێچەوانە ئەبێتەوە ، وەخاوەنگیان . . .

بەڵام خاوەنگیانی بەشەرەف ، گیان ئەداتو شەرەفی ئەسێنێتەوە ، کاتێ کە مەبەستێکی گرنگ ، واتە ناوی شەرەف دێتەپێشەوە ئیترگیان لای لاوانی گۆرەپانی شەرەف ، ئەونرخەی خۆی لەدەستئەدات ، بەڵکو ئەبێ بڵێین گیان هەربۆئەوەباشە ، کە لەبارمتەی شەرەفابێت ،

بێگومان ئەوپرسیارە دێتەپێشەوە ئەڵێن کەوابو شەرەف کامە ، کەوا گیانی شیرین لای مەردی بەشەرەف نرخوبایی خۆی لەدەست ئەدات ؟ بێگومان پاراستنی ناموس یەکێکە لەوشتانەیە بەڵام گەورەترین ناموس لایمەردی بەشەرەف خاکیوڵاتە چونکو شەرەف زۆرشت ئەگرێتەبەر بەتاكتاك کەهەریەکەی

بۆخۆی بەشێکە لەناموسی مرۆڤ ، بەلاّم وەتەن وەنیشتمان بەجارێکا هەموی ئەوتاکانە ئەگرێتەوە ، ئەوەی ماوەبدات کەدوژمن بێت وەخاکەکەی پێ‌شێل‌کات هەموی تاك‌تاکی ناموسەکانی تری لەدەست‌داوە ،

بەلاّم ئاياهەموکەسێ وەهەموتاکێ مەردی گۆرەپانی گیان‌بەخت‌کردنە لەرێگەی پاراستنی ولاّتو نیشتمانا ؟ .

ئەگەروابوایێ ئیتر نرخی گەورەپیاوانو خەبات‌کاران چی‌ئەبو ! ! ! !

کەواتە ئالاّ هەل‌گرانی پیاوەتیو مەردایەتی بەوانەئەلّێن کە سەلماندبێتیان گیانیان ئەوگیانە خۆشەویستەی کەوتمان هیچ‌سەرمایەێیك نیە بتوانێ بەرانبەری لەگەل‌بکات ئەوگیانەیان لەرێی پاراستنی نیشتمانەکەیاندا قوربانی‌کردبێت بەلّێ ئەوقارەمانانە بەبەخشینی گیانی خۆیان نەك تەنها هەر شەرەفی خۆیانیان پاراستوە بەلّکو شەرەفی هەموی‌گەلیان پاراستوە ، شەرەفی هەموی دانیشتوانی ولاّتیان پاراستوە ئەوان بەکردەوە ، نەك‌بەزوان ، بەکردوە نەك هەربە خۆهەل‌کێشان بەئێمەو بەمێژویان سەلماندوە کەمەردی گۆرەپانی خەباتو پاراستنی ناموسی خۆیانو هاو ولاّتیانن .

بەلّێ تەنها خاکی‌نیشتمانە ئەکرێ بەرانبەر بەگیان بکرێتە ترازووەوە تەنها خاکی نیشتمانە کەهاوسەنگی گیانی‌شیرینە ،

لەوهەل‌سەنگاندنەدایە کە لای مەردی بەشەرەف ئیتر گیان ئەونرخوبایەی لەدەست ئەداتو زۆر هەرزان ئەبێت ،

لەوهەل‌سەنگاندنەدایە دەرئەکەوێ کەئەکرێ گیان بدرێت بۆ وەرگرتنەوەی خاکی‌نیشتمان بەلاّم مەردی‌بەشەرەف هیچ‌کاتێ ئامادەنابێ خاکی‌ولاّتەکەی بداتو گیانی‌خۆیی پێ‌بکرێت کەچی زۆرباش ئامادەیە گیانی لەپێناوی ولاّتەکەیا لەرێگەی پاراستنی ناموسی خۆیو گەلەکەیا بەخت‌کات .

کاتێ کەدوژمن ترازو دائەنێ بۆکرینی ولاّت یان‌پیلان‌ئەگێرێ بۆ داگیرکردنی نیشتمان لەوکاتەدایە دەرئەکەوێ کەخاکی‌ولاّت چەن‌بەنرخوشیرینە وەگیان بەخت‌کردن لەرێگای پاراستنیا چەن سەربەرزیوشەرەفە لەولاشەوە هەرلەوکاتەدایە بۆهەمو مەردێ روون ئەبێتەوە کەفرۆشتنی خاك چەن‌ناشیرینو سەختو سەرشۆری‌یە .

کەوابو بۆیە پلەی شەهیدان هەم‌لای‌خواو هەم‌لای ئێمەش ئەوەندە بەرزە بۆیە هەمو ئەلّێن شەهید نامرێ ، مەبەست لەونەمردنەدا ئەوەتە هەمو هەر ئەبێ بمرین ئەمرۆنا سبەی ، جائەوەی کەهاتو بەدەستی‌خۆی وەبۆپاراستنی شەرەفی گەلو ولاّتەکەی گیانی خستە سەر سەوداو فرۆشتی تاخاکەکەیی پێ‌بکرێتەوە بەراستی ئەوەتامەرد ، خوا ئەفەرمێ وامەزانن گیان بەخت‌کەرانێك کەگیانیان لەرێگەی خوادا بەخت‌ئەکەن « مردوون» ئەوان زیندوون ، دیارە پاراستنی مالّوناموسو شەرەف پاراستنی‌ولاّت لەدەس دەس‌درێژکەران دەستوری خوای‌گەورەیە .

## هەروەها هەمومان ئەو وتەگرنگەی

«سەرۆك صەدام حوسەنیمان لەیادەو لەگوێ‌ماندا ئەزرنگێتەوە ، کەوتیان شەهیدەکان لەهەمومان بەرێزترن» درودی ئێمەش لەگەل‌ ستایشی بێ‌پایاندا بۆئەوانەی کە بە بەخت‌کردنی گیانی خۆیان پەرژینو شورەێیکی بتەویان بە هەر چواردەوری ولاّتەکەماندا کێشاوە بۆپاراستنی ولاّتو دانیشتوانی ولاّت لەدەست دەست‌درێژکەران ، بەراستی کام‌سەخی ئەتوانێ سەرمایەێیك ببەخشێت کەبەنرخترێت لەگیان کام‌خەبات گەورەترە لەگیان بەخت‌کردن ؟

کەواتە ، درودی خواتان‌لەسەر ئەی‌شەهیدان ئەی‌قارەمانانی رێگەی پاراستنی‌ولاّت لە پۆزەی چلّکنوپیسی گورگی دوژمن ، دوژمنی داگیرکەر هەرچەن لاشەتان وەکو هەمو مردوێیك خرابێتەگلّەوە ، بەلاّم یادتان‌هەمیشە والەناو دلّودەرونی هەموعیراقیێکی بەشەرفی دلّسۆزا ، بەراستی ئێوە لەهەمومان مەزنترو بەرێزترو سەربەرزترن .

خاکی سەرگۆری ئێوەی قارەمان
وەك توتیایە بۆگلّی چاوان
ئەوەی گیانی خۆی کردەقوربانی‌ی
بۆپاراستنی هاونیشتمانی
هەتاهەتایە ماوەو سەربەرزە
رێزلی‌گرتنی لەسەریان فەرزە

# « گیانی شەهید »

**- هیوا -**

تۆ ئەی گیانە پیرۆزەکە . . ئەمرۆ لەسەر سنوور لە پێنجوین . . یاخود دوێنێ لە بەرەکانی تری سەر سنووری عیراق بە گوللەی دوژمن ، بە تۆپی رژێمە چاوچنۆکەکەی ئێران . . ئەوانەی کە نایانەوێ عیراق سەربەستو پێشکەوتوو بژیو گەلی کورد لە کوردستانی عێراق خاوەنی مافی نەتەوایەکیو ئۆتۆنۆمی بێتو پێشکەوتوو بژی . . کە پێکرای . . گیانت لا خۆشەویست بوو ، بەلاّم بە نیشتمانت بەخشیو سەربەرزیت لەلا پەسەندتر بوو . . ئەو گیانەی کە دژی رژێمی نەزانی ئێران دەست درێژکاری سەر وولاّتەکەت بۆ بەرگریکردن لە سەربەستیو خۆشی هێلانەکەت بەخشیتو لە دایكو کەسو کارت ، لات پەسەندتر بوو .

تۆ ئەی گیانە پیرۆزە بێ گەردەکەی لە ژیان گەیشتوویو لە راستی ئەزانیو عیراق نیشتمانو عیراقی یەکانت خۆش ئەوێو بە تەنگ بەختیاریو پێشکەوتنی هەموو کەسێکی نیشتمانەکەتەوە بوویت . . و هەزار قوربانیت دا . . بۆ ئەوەی خزمەتی عیراقی یەکانو مرۆڤ پێ بکەیت . . تۆ دایكو باوکتو براو خوشکتو دەسگیرانت لا خۆشەویست بوو . . بەلاّم ئەمانەت گشت بە گیانت نەئەگۆریەوە چونکە لە سەروو ئەمانەوە ، شتێکی زۆر پیرۆزو خۆشەویستت هەبوو کە عیراقی نیشتمانت بوو سەربەستیو کامەرانیو وئاسوودەیی عیراقت بوو . .

بۆیە هەرکەبیستت وا رژێمی ئێرانی رەگەزپەرست ئەیەوێ شارو دێهاتو ولاّت تێك بداتو هەرەشەی لە پێشکەوتنو ژیان ئەکرد . . خۆت پێ نەگیراو دەستت دایە چەك بۆ لێدانی ئەو دوژمنەی کە ئەیەوێ نیشتمانت ژێر دەستە بکاتو عیراقیەکان بگەڕێنێتەوە بۆ دەوری برسێتیو هەژاریو نەخۆشیو نەخوێندەواری .

بەلێ بەم باوەرە پیرۆزەوە بۆ بەرگریکردن لە خاکی عیراقی خۆشەویستو لە ئارامی عیراقی یەکان ، گیانی خۆت بەخشیو سەربەرزانە لە پێناوی خاكو میللەتەکەتدا گوللەی رژێمی خۆفرۆشی ئێران سەر دلێ پێکایت . . . تۆ ئەی گیانە مەزنەکە . . شەهیدی . . چونکە قوربانی ولاّتی عیراقو سەربەستی عیراقی یەکانی . . . هەرگیز نامری . . . نامری هەتا هەتایە . . نامریو خۆشەویستی هەموو کەسێکی عیراقیو بیروباوەر گەشی لەبەر ئەوەی کە هەلّگری ئالاّی مرۆڤایەتیو ئاسایش بوون لەم عیراقە خۆشەویستەماندا نامرن . . . تۆ ئەی ئەو شەهیدەی قوربانیت بە گیانت دا لە مەیدانی پیاوەتیو عیراقپەروەری دا دژی ئەو رژێمە نەزانەی ئێران کە رۆلّەکانی ئێران گەلی کوردی ، کوردستانی ئێران تووشی چەرمەسەریو دەربەدەریو کوشتنو برینکردوەو شارو دێهاتیان ئەسووتێنێ . تۆ نامری . . چونکە بەرگریت لە بیروباوەرێك کردووە کە بیروباوەری عیراق خۆشەویستنو پێش خستنە ، بیروباوەری یەکێتی هەموو عیراقی یەکانە .

ئێوە ئەی شەهیدەکان کورد . . عەرەب . . عیراقی یەکان هەرگیز وەفاو دلّسۆزی ئێوەیان لە بیرناچێتەوە ، چاوی دلّنیایی لێك بنێنو دەستی ئارام بخەنە ژێر سەرتان . . ئێوەبوون ئەو قەلاّیە مەزنەنان بۆ عیراقی خۆشەویست دروستکرد ، کە هەمیشە سەربەرزی عیراق لە دوژمنە رەگەزپەرستەکانی ئێران ئەپارێزێت .

عیراق ئەمرۆ لەسایەی قوربانیدانی ئێوەو لە سایەی یەکێتی عیراقی یەکانو سەزکردایەتیە لێهاتووەکەی تێکۆشەر صدام حسین بە هێزترە . . ئێستا هاورێکانتان لەسەر سنووری عیراقی سەرکەوتوومان دەستی دلێرانە لە رژێمی ئێرانی نەزان ئەوەشێنو خواستە پیرۆزو رووناکەکانی ئێوەو کوردو عەرەبی عیراق وەدی ئەهێننو پارێزگاری عیراقی پێشکەوتوومان ئەکەن .

هەزاران سلاّو لە گیانی پیرۆزتان ئەی شەهیدانی عیراق . . ئەی شەهیدانی ریێ سەربەستیو گەشەسەندنی عیراق . . ئەی هەلّگرانی ئالاّی برایەتیو ئاسایشو برایەتی . . ئەی ئەو گیانانەی خۆتانکرد بە مۆم بۆ رووناك کردنەوەی نیشتانەکەتان .

ئێوە ئەو بیروباوەرە گەشە مەزنەن کە ئەمرۆ هەموو عیراقی یەك بۆ پاراستنی ولاتو خۆی دژی هەموو دوژمنێك کە دوژمنی یەکێتی عیراقە .

هەر بەو گیانەی ئێوە شەوەیە کەدەستی دلێرانە لەو رژێمە بۆگەنە ئەوەشێنو سەرکەوتن بە دوای سەرکەوتن وە دەست ئەهێنن .



لە پیاوێکی بە ساڵا چووم بیست ووتی ، لە زەمانی زووەوە رۆژێکیان پیرەژنێکی کورد لەسەر کانیەئاوێك دانیشتبوو ، لە ناکاو یەکێ لە فەرماندەکانی سوپای ئێران ، کە خەریکی شەرکردن بوون لەگەڵ کوردەکان ، سواری ئەسپێکی دوساڵەیی لاواز ببوو . بە خێرایی و تۆزکردنەوە لەبەر دەم پیرەژنە کوردەکە وەستاو داوای ئاوی کرد ، پیرەژنەکە لەجیاتی ئەوەی ئاوی پێبدات بەسەر سورمانێکەوە ووتی :

نازانم ئێوە بۆچی هەر شەر ئەکەن و هەر ئەشکێن و رائەکەن ، وە ووتی :- هەر لە بێبەزەیی خۆتانە منداڵی دوانزەساڵە بە زۆر ئەهێنن و سواری ئەسپی دووساڵەی لاوازیان ئەکەن و ئیتر ئەشکێن و رائەکەن ، وە پیرەژنەکە بەمەوە نەوەستا بەلکو ئەم دێرە شیعرەی بە فارسی پێگوت :-

نیە بەکار سیا لشکر

یك مردی جنگی ، برو سدهزار

(واتە بە کار نایەت لەشکری زۆر (بێتوانا) ، یەك پیاوی شەرکەر بەرامبەر سەدهەزار (کەسی شەرنەزان) .

بەڵام وا هەزاران ساڵ بەسەر ئەم کارەساتانە تێپەریوە ، رژێمی خومەینی لەسەرەتای دەست پێکردنی شەرەوە هەزارەها خەڵکی کۆنەکردەوەو هەر کۆمەڵێك چەند مەلایێکیان بۆ تەرخان کرابوو کە قسەیان بۆ ئەکردن و هانی شەرکردنیان ئەدان لەگەڵ عیراق و پێیان ئەگوتن ئێوە بەهەشتین و ، لە سەرەتاوە زۆر خەلك بەم قسانە هەڵخەلەتابوون ، وەك شەپۆل خەڵکیان بەرەو بەرەکانی شەر رەوانەئەکردو زۆربەی زۆریان ئەکوژران .

بەڵام ئەمە زوو بۆ خەلکی ئێران روون‌بووەوەو کە درۆو تەفرەدانەو وایان لێهات ئەوەندەیان پێویست بە مرۆڤ بوو بۆ شەرکردن ، گەیشتنە رادەیێك کە ئۆتۆمۆبێلی گەورەیان ئەبردنە بەردەرگای قوتابخانەکان و منداڵەکانیان بە زۆر سوارئەکردن و بۆ دۆزەخی شەر رەوانەیان ئەکردن ، وە وای بۆ ئەم کەسە ک گوێیان لێی‌بیاکە نەچێ بۆ شەر ، گەر داوای لێبکەن بچێت یا نەچێت ئەوا مردن هەر بە چاوی خۆی ئەبینێ ! ! ئەنجام یا لە شەرا ئەکوژرێ یا بە کافری دائەنێن و ئەڵێن پیاوی ئەمریکایەو ئیتر ئەچێتە ریزی لە سێدارەدراوان .

خێزانی وا هەبوو بەیانی کورەکەی ناردبوو بۆ قوتابخانە ، دووساڵ تێپەری و نەگەراوە بۆ ماڵ ، ناوبەناویش لە ئێستگە درۆو دەلەسەکانیان ناوی خەلکیان ئەخوێندەوە کەماون و ئەوا ئەجەنگن ، کە کەس و کاریشیان بەدوایانا ئەچوون ، پێیان

ئەووتن چوونەتە (بەهەشت) واتە کوژراون ، هەزاران خێزان ، لە شەقامو کۆلأنەکان ، کورەکانیان بۆ شەر بردراونو لە پەژارە ئەژین . سەیر ئەوەیە کاتێ کە منالە بە دیل گیراوەکان ناردرانەوە بۆ ئێران ، حاشایان لێ کردو گوتیان ئەو منالأنە هی ئێمەنینو نەتەوەیەکگرتوەکانیش ئاگادار کران ، بەلأم هەر سوور بوون لەسەر قسەکەیان . ئیتر خەڵکی ئێران لەم کارە درندانەو بەردەوامبوونی شەر لەگەڵ عیراق ، کردیانە هۆیەك بۆ چەند خۆپیشاندانێکی گەورە لە دیزفولو مهاباد ، سنە تەبرێز ، کە داوای وەستانی شەریان ئەکردو نارەزایی یان بەرامبەر بە رژێم دەرئەبری .

بەلأم رژێمی خومەینی لە بێبەزەییو چاوچنۆکیو رەگەزپەرستی گەیشتۆتە رادەیێك کە مێژوو کەم شتیوا رەشی دیوە ، لە سێدارەدان شتێکی ئاسایی یەو هەموو کەس لێی تێربوون ، کچو منداڵو ژنوپیر جیاوازی نیە لە لایان ، ئەوەندەیان دەستوورو یاسا داناوە ، کە یەکێکی بێتاوانیش بێ ، یەك لەم یاسایانە هەر ئەیگرێتەوەو کە پێیوە نیوە تەمەن ئەبێ .

سەرەرای ئەم شتانەش ناکۆکیو دووبەرەکایەتی لە نێو کاربەدەستانی رژێم ئەوەندەی تر باری ئێرانی شلەژاندوەو هەر یەکێکیان بە ئارەزووی خۆی فەرمانرەوایی ئەکاو ئەوانی تر نارەزایی بەرامبەر دەرئەبرنو ئەم ئەو بە پیاوی ئەمریکا لە قەڵەم ئەدا .

کێ هەیە تاوانی -- خومەینی -- نەزانێ بەرامبەر بەگەلی کورد لە ئێران ، تەنها داوای مافی خۆیان کرد ، کە مافی میللەتان لە هەموو دەستوورو ئایینێکدا هەیە ، بۆیە کوردوستانیان سووتاندو شارەکان وێرانکران .

وا بەرەبەرە گەلانی ئێران خەریکن هێزو خەباتیان یەك بخەنو یەك لەدوای یەك وەکو شا دارو دەستەی خومەینی لە ناو ببەنو چونکە هیچ جیاوازییێکیان لە نێواندانیەو هەموویان ئارووی برکێکن ، وە ئەم نارەزاییەش لەم خۆپیشاندانانەی کە لەسەرەتاسەری جیهان ئەکرێ دژ بەم رژێمە ، وە ئەو خۆپیشاندانانەی کە لە ناوەوەی ئێران کرا لە دیزفولو تەبرێز ، دەرئەکەوێ کە گەلأنی ئێران چاویان لە دواڕۆژێکی نزیکە کە ئێران پاكبکەنەوە لەم رژێمەو ئەوەی زۆرداریو رەگەزپەرستی یە نەیهێڵنو لاپەرەیەکی نوێ بکەنەوە کە ئازادی گەلأنی ئێرانەو پەیوەندی یەکی دۆستانە لەگەڵ هاوسێکانیان ببەستنو پێشکەوتن ببێتە چارەنووسی هەموو لایێك .



# لە یادی . . . . کاروانی نەمری شەهیدان

نەسرین ژاڵەیی

ئەستێرەی گەشی شەو . . . هەرگیز بلێسەی ناشارێتەوە ، شەونخونی دایك . . بۆ کۆرپەکانی . . هەموو کاتێك بە تەوسەوە . . . ئەیگێرێتەوە ، یەك دلۆپ خوێن . . . زۆر بە نرخە . . خوێن لە برێکی کەمی ئازادی ئەبینرێ .

ئەی مرۆڤ . . تۆ کاتێك ئەمریت‌و جیهان بە جێ ئەهێلیت ، ئەوا رێگای خۆتەو . . مافت لەم رێگایە هەیە . . ئەبێ وەری بگریت بەڵام ئەی مرۆڤ کە تۆ جیهان بەجێ ئەهێلیت‌و . . سەرتاپای گیانت بە خوێن رەنگ کراوە . . کاتێ پێلوی چاوەکانت لەسەر یەك دائەنێی بۆ دواجار . . مافی خۆتەو سەربەرزیتە . . لە پێناو ئەو خاکەی ناوی بە تۆ بەستراوە . . ئەو دلۆپە خوێنانەی کە گیانیان سوور کردی . . گەورەترین پاداشتە بۆ لە خۆبوردنت لە رێی ئەم خاکە . . پیرۆزە . . دڵگیرە .

فارسە رەگەزپەرستەکان . . هەزاران لاویان لێ شەهیدکردین‌و ئەم جیهانەیان بە جوانەمەرگی بە جێ هێشت‌و . . رویان کردە کاروانی نەمری شەهیدان . . کە هەموو ئابرۆمەندێك هیوای بۆ ئەکات .

هەزاران لە گەنج‌و لاوانی کوردوستان ، سینگیان رووبەرووی گوولله ئەبرد . . . دایکیشیان لە جیاتی خۆرنینەوەو لە خۆدان هانی ئەدان‌و هاواری ئەکرد :- ئەی کوردینە ، بەرگری بکەن لە قەڵادزێ . . لە حاجی ئۆمەران . . لە مهابادو . . لە سنە . . هاواری ئەکرد بەرگری بکەن لە عێراق . . بەرگری بکەن لە کوردستان .

ئامۆژگاریت ئەی (گیان) . . . با گیان دەرچووم . . لەسەر شاخێ بێ لە دەم رووبارێ ، با . . خوێنەکەم . . گوڵێ تێنو ئاو بدات‌و . . لاشەکەم بابێتە پەیکەرێك بۆم . . بۆ نیشتمانم . . بۆ دوژمنانم . . با بزانن ئەم خوێنە ئاڵە . . هێرشێکە بۆ سەر دوژمن .

شەهیدگیان : هیچ خامەیێك ناتوانێ شتێکت دەربارە بنوسێ زمان ناتوانێ لەبارەتەوە بدوێ . . هەموو شتێکت بۆ کەمە بەڵام ئەبێ بە ئەوەندە رازی بیت . . کە تێکۆشەر صدام حسین ئەڵێ «ئێوە لە گشتمان پیرۆزترو بەرزترن» .

ئێوە لە دڵ‌و دەروونی ئێمەدا ئەژین .

ئەو چەپکە گوڵەی . . ئەیخەینە سەر گۆرت ، بە دڵێکی فراوان . . باوەشی بۆ بکەرەوە . . پێشکەشی تۆ ئەکرێت ، لەو کەسانەی کەتۆ بەرگریت لێ کردن . . بە خوێنی گەشت . . شیعری پیرەمێردی نەمرتان . . لە یاد نەچێت . . ئەی شەهید . . کە هەموو رۆژ ، هەموو کاتێك . . گیانت پێ ئەداتەوە . . گەلێ هان ئەدات . . بۆ رووی دوژمن . .

پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن شیوەن‌و گرین
نامرن ئەوان ، وا لە دڵی میللەتا ئەژین

کاتێ کە دێینە لات . . سەرت لێ ئەدەین . . پەیمان بلێ‌و . . فێرمان بکە . . ئەم رێگایە چەند خۆشە کە تۆ گرتوتە بەر تاکو ئێمەش بەڵێنت پێ بدەین‌و . . سوێندت بە کوردستان بۆ بخۆین . . ئەوا هاتین‌و ئێمەش لە دوای تۆین .




جەنگی دادەوەریمان . جەنگی قادسیەی صدام دژی ئێرانی دوژمنی چاوچنوك پێی ناوەتە چوارەمین سالەیەوەو بە درێژایی ئەم چەند سالە جەنگاوەرە نەبەردەکانمان شێرانە هەلمەتیان بردورەتە سەر دوژمن و بەرپەچیان داوەتەوە . جەنگاوەرە بەجەرگەکانمان بە دەست و بازووی بەهێزیان کارێکی وایان پێ کردوون کونە مشکیان لێ کردوون بە قەیسەری گیانی خۆیان بە نیشتمانی خۆشەویستی‌یان بەخشی . ئەو گیانە ئازیزە کە لە هەموو شتێ ئازیزترە بە نیشتمانی ئەبەخشێ و خوێنی ئالی گەشی زەوی ئاو دەدات لە پێناوی سەربەستی و سەربەرزی وولاتە نەمرو ئازیزەکەمان عیراق .

لەم رۆژە ، رۆژی ١٩٨٢/١٢/١ پار خومەینی چەپەڵ و نەزان گیراوە عیراقی‌یەکانی تیرە بارانکرد درانە بەر گوللەو دەست رێژکران . گیانی ئازیزیان لە دەست چوو ئەم کردەوە نامرۆڤایەتی‌یە کەوا خومەینی و داروەدەستە نەفام و چەپەلەکەی دەیکات بۆ کوێیان دەبات و بۆ کوێیان دەگەیەنێت ؟ !

سوپا نەبەزەکەمان بە کوردو عەرەب و هەموو برا کەمایەتی‌یەکانی تر لە سەرانسەری بەرەکانی جەنگ — لە طیب ، شیب — فەکە — مندلی . حاج ئۆمەران — پێنجوین . . .هتد پالاوانانە سەرکەوتنی تازەیان تۆمارکرد چ لە بەرەی جەنگ و چ لە بیروباوەرەوە . حوکمڕاکانی ئێران بێ شەرمانە ئەم تاوانەیان کرد— گیراوەکانیان گولەرێژکرد وایان دەزانی گەلی عیراق دەستەپاچە ئەوەستێت نەیزانی ووزەو توانایان رۆژ بە رۆژ تا دێت بەهێزتر دەبێت و گەلەکەی گەلی عیراقی

خوراگرتوو هەمیشە پشتگیری سەرکردایەتی‌یەکەی دەکات . ئەو بایە زەردەی کە لە ئێرانەوە هاتووە بە زەبری شمشێر . چەك . تۆپ ئەیوەستێنێت . چەك هەلدەگرن و بەرگری لە نیشتمان و گەل دەکەن . چونکە ئێرانی دوژمنی رەگەزپەرست لە پەشیمانی و نائومێدی و سەرشۆری هیچی بەو لاوە بۆ نامێنێتەوەو تا دێت هەلەی زۆرتر دەکات بەهەق سەرکەوتن بەلام هەر بۆ عیراق چونکە هەرچی خۆیان کۆبکەنەوە ناگەنە توانای عیراقی‌یەکان و عیراقیش ئامادەیە هەمیشە بجەنگێت چونکە تووشی بووەتە تووش سەگێکی هارو بە زەبری شمشێر نەبێت ملی نابردرێت .

شەهیدەکانی جەنگی قادسیەی صدام لاپەڕەیەکی زێرینیان لە مێژوو تۆمارکردو بۆ وولاتانی عەرەب و هەموو جیهانیان چەسپاند کەوا خاوەن هەقن و سورن لە سەر ئەوەی هەقی خۆیان لە چاوی دوژمن دەربهێنن ، بایەخ بەوە نەدەن کە چەند شەهیدیان لێ بکەوێت . لە سەر کاروانی سەرکەوتندا هەر بەردەوام بن کە ئەم کاروانەش هەر بە خوێن ئەکرێت .

لەم رۆژە پیرۆزە بە گەرمی یادیان ئەکەینەوەو قەد لە بیرمان ناچنەوە رۆژ بە رۆژ گەورەتر دەبن لەبەر چاومان ، چونکە سەریان بەرزکردین .— دایك . خوشك . برا . باوك ، دراوسێ هەموویان شانازیان پێ ئەکەن کاتێك بە ئالای عیراق ئەپێچرێنەوە . ئەمە نیشانەی سەربەرزیە چونکە لە پێناوی کەرامەتی ئەماندا پێکان و گیانی‌یان بەخشی .

نەمری و پیرۆزی بۆ شەهیدانی قادسیەی صدام ئەوانەی لە پێناوی نیشتماندا لە قوربانیداندا کەمتەرخەمی‌یان نەکرد .

# لە پێشانگای چوارەمی ڕۆژنامەنووسی کوردی لەشاری کۆیەدا

دەزگاکەمان . دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی لە ٥ و ٦ی ئەیلوولی ئەم ساڵدا پیشانگای چوارەمی ڕوژنامەنوسی کوردی لە شاری کۆیە ڕێك خست . ئەمەش یەکێکە لە چالاکی یە بە نرخ و زۆرەکانی ئەم دەزگایە کە لە چەند شارێکی تری کوردستاندا بە بۆنەی تێپەڕبوونی سێ ساڵ بە سەر جەنگی بەرگری کردنی عیراقاندا دژی چاوچنۆکی ڕژێمی دواکەوتووی ئێران . جەنگی قادسیەی صدام . نواندی . پیشانگاکە بە جوانی لای ڕۆشنبیران و ئەدیبانی کۆیە پێشوازی کراو وێنەیەکی جوانی خەباتی ڕوژنامەنوسیی کوردی خستەڕوو .

لە ئێوارەی دووەمی پیشانگاکەشدا . برای نووسەر عبدالرزاق بیمار دەربارەی ڕەوتی ٨٥ ساڵەی ڕۆژنامە نووسیی کوردی ووتارێکی پێشکەش کرد کەوا دەقی ووتارەکە پێش کەش بە خوێنەرانی گۆڤارەکەمان دەکەین .

-ڕۆشنبیری نوێ

میوانە بەرێزەکان .

ڕۆژنامەنووسی لەم چەرخی تازەدا ، یەکێکە لە نیشانەکانی پێشکەوتن و هوشیاریی نەتەوەو کراوە بە عادەت هەمووساڵێك ڕۆژێکیان تەرخان کردووە بۆ جەژنی ڕوژنامەنووسی و بەهۆی نرخ و بایەخی ڕوژنامەنووسی لە ژیانی میللەتدا ئاهەنگی بۆ دەگێڕن و بەریزەوە بیرەوەریی ئەو ڕۆڵە پێشڕەوانە دەکەنەوە کە بەردی بناغەی ئەم کردەوە مایەدارەیان داناوە ، هەروەها پیشانگای گەورە ڕێك دەخەن بۆ پێشاندانی نموونە جوانەکانی گۆڤارو ڕوژنامەکان .

ڕۆژنامەش بەوشێوە نوێیەی کە هەیە ، لە جیهاندا نزیکەی چوارسەد ساڵێکە پەیدابووە ، کە یەکەم ڕوژنامە ساڵی ١٦٦١ لە لایپزك لە ئەلمانیا سەری هەڵداوەو دواییش بە هەموو ئەوروپادا بڵاوبوەتەوەو تا وای لێ هاتووە هەر شارەی چەندەها ڕوژنامەو گۆڤاری لێ دەردبچێت و ڕوژنامەی و گۆڤاری واهەیە بە دەملیۆن و بیست ملیون دانەی لی چاپ و بڵاودەکرێتەوە .

بەڵام ئێمەی کورد ، وەکو حاجی قادر فەرموویەتی :

# * شەهیدەکان لە هەمومان شکۆدارترن

هەر کوردە لە بەینی کوللی میللەت
بیٚبەهرە لە خوێندنو کیتابەت
بێگانە لەتەرجەمەی زمانی
ئەسراری کتێبی خەلکی زانی

سەرەتای میژووی یەکەم روژنامەی کوردی دەگەرێتەوە تەنیا (٨٥) سالٚ واتا لە سالٚی ١٨٩٨ کە یەکەم روژنامەی کوردی بە ناوی کوردستان دەرچوو سەرەتای پەیدابوونەکەشی لاوازو بیٚهێزو ئیتر رەوتی روژنامەنووسی کورتو پچرپچر بووەو روژنامەکان کەمتەمەنو پەرش‌وبلاٚوو هەر روژە لە شارێكو لە دەرەوەو ناوەوەی وولاٚتدا لە خەباتی مەرگوژیاندابوون .

لە ئەنجامی حوکمی دواکەوتووو کۆنەپەرستانەی عوسمانلیو ئیرانی داکە چەنگی ئاسنیان لە بینەقای گەلی کورد گیرکردبوو و خاکی کوردستانیان لە ناوخۆیاندا دابەش‌کردبوو ، ژیانی کۆمەلاٚیەتی گەلی کورد لەوەدانەبوو کە بتوانیٚ لەژێر کۆتوزنجیری دیلیو ژێردەستیدا زوو چینێکی رۆشنبیرو خویندەواری وەها پیٚبگەیەنیٚ کە ببنە پێشرەوی گەلی کورد لە سەدەی تازەدا . عەلاقاتی بەرهەمهێنانی کۆنینە لە کشتوکالٚدا لەگەلٚ دابران لە بازاری جیهانیو بیٚئاگایی لە پێشکەوتنی پیشەسازی وتەکنولوجیاو گۆشەگیریی ناوچەکانی کوردستان لە رووی دەرامەتەوە ، لە ئەنجامی دەسەلاٚتی حوکمێکی ئوتوکراتیی کۆنەخوازی ، پارێزەری هەموو دامو دەستوور و دەزگایەکی کۆمەلاٚیەتی سەردەمەکانی چەرخی ناوەراستدا ، ئەمە وای کرد کە درەنگ چینی خوێندەوار پیٚبگاتو بێت رۆشنبیریو روژنامەنووسیو ئەدەبو نووسین بکاتە چەکێك لەتەك چەکەکانی تری مەیدانی شەری مافی سەربەستی نەتەوە ، میللەت بەکاری‌بهێنیٚ .

بە تایبەتیش سیاسەتی سولٚتانەکانی ئەم دوایيەی عوسمانی کە هەمیشە هەولٚیان‌دەدا شەپۆلی پێشکەوتنی پیشەسازی ئەورو‌پاو بیروباوەرە تازەکانی دوای شۆرشی فەرەنسای وەکو سەربەستیو دادو یەکسانیو مافی نەتەوەکان . . نەپەرێتەوە خاکی تورکیا ، وهەمیشە بە بازووێکی پۆلاٚییەوە باوەشیان لە کۆنەکەی خۆیان گیرکردبوو لەوەدەترسان نەوەکو پای گۆرینی تەختی خۆیانو دەستەودایەرەکەیان وەربگێریت .

بەلاٚم هەموو تەقەللاو هەولٚی کاربەدەستانی ئیمپراتوریەتی عوسمانی لەم رووەوە بیٚمایە دەرچوو چونکە ، هیچ دیوارو شوورەیەك خۆی لەبەر لافاوی بیری ئازادیی گەلانو مافی مرۆڤایەتی ناگرێت . .

ئەوەبوو نەتەوەکانی وەکو ئەرمەنو عەرەبو کوردو تاد کەوتنە جوولاٚنەوەو هوشیارکردنەوەو پەوکردنی گیانی نەتەوایەتی ، لە رێگەی هاندانی خوێندنو خوێندەواری‌یەوە شان‌بەشانی زیندووکردنەوەی ئەدەبیاتو گەشەپێدانی زمانو بلاٚوکردنەوەی کتێبو روژنامە .

ئیتر با دونیا هەموو داوو تەلبەند بێت رێگە لە ئازادانی نەتەوە ناگیریت بۆ ئەوەی مافی ژیانی میللەتەکەیان بە سەربەستیو ئازادی داوابکەن . . کارەساتو رووداوی مێژووی دوورو نیزیکیش روونی دەکەنەوە کە نەتەوەی کورد ، نەتەوەیەکی زیندووە ، هەتا سەر کۆتی دیلی قەبوول‌ناکاتو لێهاتووەو لە توانایدایە بەگەلٚ کاروانی تێکۆشانی مافو دادو سەربەستی بکەوێتو هەتا دواقۆناغ رێگە وون نەکات .

بۆیە هیچ بەندو بەستێك رێگەی لە لاوانی کورد نەگرت بۆ ئەوەی چەکی تێکۆشانی تازە بەکاربهێنن ئەویش کە روژنامەنووسی‌یە ، ئەوەبوو لە ١٨٩٨ بەر لە ٨٥سالٚ مدحت‌مقداد و عبدالرحمن کورانی ئەمیر بەدرخان‌پاشا رۆژنامەی (کوردستان)یان دەرکرد ، بەلاٚم لە خاکی تورکیادا نا ، بەلٚکو لە قاهیرە . ، (لە ژمارە یەکەوە تا پێنجی لە قاهیرە دەرچوو پاشان گواستیانەوە (جنیف) جاریکی‌تر قاهیرەو ئنجا لەندەن ، پاشان فولکستونی خوارووی ئینگلتەرەو ئنجا جنیف . بە هەمووی ٣١ ژمارەی لیٚ دەرچووە) .

ئەگەر چی روژنامەی‌کوردستان لە دەرەوەی کوردستان چاپ دەکرا ، بەلاٚم زووبەزوو دەگەیشتە دەست خوێندەوارانی کوردو بە تاسەوە وەریان دەگرت . روژنامەکە هەمیشە نامەو بەرهەمی کوردانی لیٚنەدەبرا . سەرەرای هەموو کۆسپو راونانو زەبروزەنگی میری روژنامەکە هەر رێبازی خەباتگێرانەی خۆی پاراست .

چاوگێرانێك بە ناوەرۆکی ئەو ژمارانەدا کە لەم دواییەدا لەبەغدا بە ئوفسێت چاپ‌کرانو لە بەرگێکدا کۆکرانەوە دەردەکەویٚ کە ئامانجی هەرە دیاری روژنامەکە هاندانی پێش‌خستنی خوێندنو خوێندەواریو داواکردنی عیلمو سەنعەتو کودنەوەی قوتابخانەبوو . لە رووی‌سیاسییشەوە ، سەرەتا بە تایبەتی لەژمارەی یەکەمدا نەرموشلیو ستایشی سولٚتانی نوواندوە ، بەلاٚم لە ژمارەکانی تردا پشتگیری خەباتی

بەرهەڵستانی رژێمی ستەمکار دەکات . تا دوا ژمارەی (کەتا ساڵی ١٩٠٢ دەوامی کرد) رۆژنامەکە « لە رێبازی کوردایەتی راستو خاوێن لای نەدا» . باری سیاسی وامایەوە تا سەرکەوتنی شۆرشی ١٩٠٨و جاردانی دەستوورو لێ خستنی سوڵتان عبدالحمید . ئەوسا بزووتنەوەی کوردی بووژایەوە ، بۆ یەکەم جار چەند کۆمەڵەو دەزگایەکی رووناکبیری سیاسی بەخۆیەوە بینی ، ئیتر چەند رۆژنامەو گۆڤارێکی مایەدار دەرچوون وەکو گۆڤاری (تەعالی و تەرەقی کوردستان) هەروەها رۆژی کورد ، یەکبوون .

لە عیراقیشدا یەکەم نیشانەی رۆژنامەنووسی لە ساڵی ١٩١٤دا لە بەغدا لە شێوەی گۆڤاری «بانگی کورد»دا خۆی نواند . کە جەمال بابان دەری کردووەو ئەویش رێبازی هوشیاریکردنەوەی نەتەوەو هاندانی خوێندەواری و بلاوکردنەوەی رۆشنبیری لە ناو کورددا نیشانکرد ، بەلام بەهۆی هەڵگیرسانی یەکەم شەری جیهانەوە لە دەرچوون وەستا .

لە دوای بروانەوەی شەرەکەدا ، پاش ئەوەی رژێمی شوڤینی تورکانی لاو کەوت ، ئەو رژێمەی هەر زووبەزوو کە دەسەلاتی گرتەدەست پەردەی لە رووی خۆی هەڵماڵی و ئامانجی دەمارگیری نەتەوەی ئاغاو تواندنەوەی نەتەوەکانی تری ناو دەوڵەتی عوسمانی ئاشکرا کردو هەناسەی لە رۆژنامەنووسی کوردی بری . دووبارە رۆژنامەنووسی سەری هەڵدایەوەو گەرمو گورتر هاتە مەیدانەوە .

کەوا لایەنی سیاسی گەشەدارترو ئاشکراتر هاتەپێشەوەو گۆڤارو رۆژنامەکان بوون بە دەنگو بانگی بزووتنەوەی نەتەوەیی و ئاوێنەی سیاسەتی ئەو سەردەمە . بە تایبەتی لە تورکیادا هیواو ئاواتی کوردییان لە دەستگیرکردنی مافی نەتەوەیی دا دەخستەروو . . وتارو هەڵبەستە نایابەکانی (ژین) و (کوردستان) نموونەی بەرزی رۆژنامەنووسی ئەو سەرەتایانەن .

ئەو رایەی کە دەڵێ رۆژنامەنووسی کوردی چەکی خەبات بووەو شێوەی خەباتگێرانەی خۆی لە پێناوی داواکردنی مافی نەتەوەییدا پاراستووە ، رایەکی بەجێیەو لە رووی چەندو چۆنی و ناوەرۆکی رۆژنامەو گۆڤارەکانەوە لە راستی بە دوورنییە .

تەنانەت بوونی رۆژنامەیەك لەو سەرەتایانەدا با بە ئاشکراش ئالای بەربەرەکانی رژێمی هەڵنەگرتبێ ، کە هاتو خەمی هوشیارکردنەوەی رۆڵەکانی گەلی کوردی خستە ئەستۆو نموونەی پێشکەوتنی گەلانی خستنە بەرچاوو غیرەتی بزووتنەوەی بەبەر گیانیان هەڵدا . . ئەمە لە خۆیەوە خەباتێکی رێکوپێكو ئامانج شکێنە .

لە لایەکی ترەوە ، دەرکردنی رۆژنامە بە زمانێك کە لە هەموو بە شەکانی کوردستان بەبێ مافو دیلو ئامادەی لەناوچوونو لێ کەم کردنەوە بووبێت ، بەلگەی پێ لێ داگرتنە لە پاراستنی قەوارەی نەتەوەیی و زیندووکردنەوەو گەشەپێکردنی زمانەکە ، تەنانەت رۆژنامەدەرکردن بە زمانەکە . . ئالا بەرزکردنەوەی گیانی بەربەرەکانیی نەتەوەییەو یاخی بوونە لە خواستی داگیرکەرانو دوژمنانی کوردو سەرشێواندنە لە نەخشەکانیان بۆ بێ ئاگایی و کلاکردنی کورد لە رۆژگاری سیاسەتو بۆپێ پێل کردنی مافی نەتەوەییان .

هەر بۆیەیە ، سەرەتاکانی رۆژنامەنووسی کوردی ، لە یەکەم ووشەو دێری رۆژنامەی کوردستانی قاهیرەوە کە بە بسم اللەو حەدیثی پێغەمبەرو ئایینداری و مایەی عیلمو هونەر دەستی پێ کردووە ، تا هاوار گەرمترینوتارو هەڵبەستی ئازادی خوازیی گۆڤاری (ژین)و (کوردستانەکەی میهری و بانگی کوردو رۆژی کوردی سلێمانی ، بە سەرەتایەکی پیرۆزو بەنرخ دەزانرێ بەبەردی بناغەی رۆژنامەنووسی بە بزاوتی نەتەوەکەمان هەڵدەسەنگێنرێ .

هەرلەو سەرەمەشدا بۆ یەکەم جار پروپاگەندەی بێگانە ویستی سوود لە رۆژنامەنووسی کوردی ببینی و پلانو سیاسەتی دەوڵەتی بەناو کوردا بلاوبکاتەوە . ئەوەبوو لە ساڵی ١٩١٧دا ئینگلیزەکان کە بەغدایان داگیرکرد گۆڤارێکی کوردی یان بەناوی « تێگەیشتنی راستی»یەوە دەرکرد ، کە مایەی خۆش بەختیانە مامۆستا دکتور کمال مظهر بەرەنجو کۆششی دڵسۆزانەی خۆی بەبۆنەی زیندووکردنەوەی ژمارەکانی ئەم گۆڤارەوە کەشکۆلێکی زانیاریی رۆژنامە نووسی کوردیی پێشکەش کردین ، کە سەرچاوەیەکی بە نرخو بەهادارە بۆ ئەمرۆو بۆ دوارۆژ جگە لەوە کە ناوەرۆکی ژمارەکانی ئەم گۆڤارەی پێ ناساندین زۆر زانیاریی بەکەڵکیشی پێ نیشان داینو بۆی راستکردینەوە ، من لەم ووتارەمدا ئەوم کردووە بەیەکە سەرچاوەی باوەر پێکراو .

ئەم گۆڤارە دەمودووی ئیمپریالزمو داگیرکەرانەو قسە لەگەڵ کورد دەکاتو ئەوەی لەکتێبەکەی مامۆستادا سەرنج رادەکێشێ ئەوەیە بایەخێکی زۆر بە ناوەرۆکەکەی دراوەو دەربارەی دەوری ئەدەبیاتەکەی زۆری لەسەر نووسراوە ، بەلام گۆڤارەکە لەوە ناچێت ئەوسا لە ئەدەبیاتی کوردیدا دەورێکی کاریگەری

دەبینێت . چونکه ئەوەی بلاوی‌کردوەتەوە بریتی‌یە لە ئەدەبێکی کۆنو شتێکی لەبەرهەمی ئەدەبی هاوچەرخی تێدا نەبووەو دێرینییە نووسەرانو شاعیران بەرهەمی ئەو رۆژگارەی خۆیان بۆ ...رد نێ . هەروەکو نامەبەری‌و پێزانینی خوێندەوارانیشی تێدا نەبووە .

پاشان ئینگلیزەکان لە نیسانی ١٩٢٠ەوە تا ١٩٢٢ رۆژنامەی «پێشکەوتن»یان لە سلێمانی دەرکرد ، دوای ئەویش لە ١٩٢٤دا رۆژنامەی «ژیانەوە» بەناوی رۆژنامەی حکوومەتی‌یەوە بە سەر پەرشتی‌ی ئەوان دەرچوو . ئەم دوانە جگە لە لایەنی پروپاگەندە بۆ نەخشەو پیلانی خۆیان ، لایەنی ئەدەبی‌و رۆشنبیریشیان گەش‌و دیاربووە ، بە پێوانەی ئەو سەردەم . بەلام رێبازی بلاوکردنەوەی رۆژنامە یەکسەر لەلایەن داگیرکەرەوە پاش ماوەیەك دوایی پێ‌هێنراو بەرامبەر بەمە رۆژنامەی خۆیی سەری‌هەلدا با بە رەزامەندیی ئەویش بووبێت .

رۆژنامەی (بانگی کوردستان) لەلایەن مستەفا پاشا یامولکی‌یەوە لە ئابی ١٩٢٢دا لە سلێمانی دەرچوو و جگە لە خۆی کە بە کوردی دەینووسی . نووسەرانو رابەرانی رۆژنامەنووسی وەکو شێخ‌نوری‌و عەلی‌کەمال باپیرو رەفیق حیلمی لە دەستەی نووسین‌دابوون رای سیاسی رۆژنامەکە کوردانەو کوردایەتی‌بوو .

دوای ئەویش (رۆژی کوردستان) هەر لە سلێمانی لە تشرینی دووەمی ١٩٢٢دا دەرچوو ، کە یەکسەر بوو بە (ئۆرگانی ئەو رژێمە کە شێخ محمود دایمەزراند) . . رۆژنامەی خەبات‌و هاواری کورد بوو بۆ دادو ماف‌و سەربەستی . هەروەها دەفتەری پرشکۆی ئاواتی پەردەگیری ئەو دەمەی نەتەوە بوو .

جێگەی شادمانی‌یە کە هەردوو رۆژنامەکە لە لایەن کاك جەمال خەزنەدارەوە کۆکرانەوەو بە ئوفسێت چاپکرانەوە . کارێکی پەسەندو بەجێ‌بوو .

بزووتنەوەی شێخ‌مەحموود جگە لەو دوو رۆژنامەیە لە دوو رۆژنامەی تریشدا دەنگی خۆی بە گەل راگەیاند ، یەکەمیان رۆژنامەی «بانگی حەق» و دووەمیشیان « ئومێدی ئیستیقلال » بوو .

دەرچوونی رۆژنامەی (بانگی‌حەق) نموونەیەکی بەرز لە مەیدانی رۆژنامەنووسی‌و سەرەتاکانی مێژووی رۆژنامەنووسی کوردیدا پێشان دەدا . کەوا لە مارتی ١٩٢٣دا کە شێخ مەحموود لە ئەنجامی شالاوی ئینگلیزەکان‌دا ناچار بوو سلێمانی بەجێ‌بهێلێ چاپخانەی (بلدیە)ی بە پشتی وولاخ گواستەوە ئەشکەوتی جاسنەو توانی سێ‌ژمارە رۆژنامە بە ناوی (بانگی‌حەق)ەوە دەربکات کە وەکو مامۆستا د . کمال دەفەرموێ « ئەمە بۆ خۆی گەورەترین بەلگەی بەرزبوونەوەی بایەخی رۆژنامەنووسی‌یە لە ژیانی سیاسی‌و کۆمەلایەتی ئەو قۆناغەی گەلی کورددا . ناوی رۆژنامەکەش بە ئاشکرا باسی ئەو حەقە دەکا کە ئینگلیز کردیانە قۆچی قوربانی بەرژەوەندە تایبەتی‌یەکانی خۆیان) .

برایانی بەرێز ،

لە سەردەمی داگیرکەرانی ئینگلیزو حوکمی پاشایەتی لە عیراقدا رۆژنامەنووسی کوردی ، سنگی دەکوتاو رێگەی بۆرەوتی خۆی دەکردەوە . رەوتەکەش نیشانەی هەناسەلێبرین‌و بەربەرەکانی کردنو دەست‌بەسەری‌و ئەرك‌و زەحمەتێکی زوری پێوە دیارە . چ بە ژمارەو چ بە چۆنیەتی ، گۆڤارو رۆژنامەکان شایانی ئەو گەلە نەبوون کە نەتەوەی دووەمی عیراقە .

رۆژنامەی خۆیی زۆر بەرەنج‌و ئازار لەسەر خاوەنەکانی دەوەستاو پارمەتیی بە تایبەتی لە لایەن دارایی‌یەوە نەدەدرانو هەمیشە بەرپرس‌و بەرهەرەشەی کاربەدەستان بوون ، گەلێکیان تارادەی لەخۆبووردن قوربانیبنیان بە مال‌و ئارام‌و سرەوتی خۆیان داوەو رەنجیان بەخت کردووە .

لەم رووەوە گەلێ نموونەی ناياب‌و جوانمان هەیە ، حسین حزنی موکریانی ، بەزمانێکی دەولەمەندو قەلەمێکی بە تواناوە هاتە مەیدانی رۆژنامەنووسی ، ئەوەبوو سەرەتا لە رواندوز لەسالی ١٩٣٢ ٢٦) گۆڤاری (زاری‌کرمانجی)ی دەرکرد کەوا هاملتون لە کتێبی رێگا بەناو کوردستاندا لەوەسفی ئەودا دەلێ حزنی‌موکریانی « خۆی بە تەنیا وتارەکانی گۆڤارەکەی دەنووسی ، خۆی بە تەنها وێنەکانی دەکێشان ، خۆی بەتەنها لە چاپی‌دەدان . ئینجا دەشی پێچانەوە ئەمە بۆ خۆی نموونەیەکی بێ هاوتایە لەسەر رووی هەمووزەمین)

نموونەیەکی پرشنگداری کۆششی رۆژنامەنووسی کوردی عیراق گۆڤاری (گەلاوێژە) ئەویش بە رەنجی خەلك‌و بی‌یارمەتی میری توانی لە سالی ١٩٣٩ تا سالی ١٩٤٩ زیاد لەسەد ژمارەی دەولەمەندی پر لە زانیاری‌و ئەدەبیات‌و هەمەجورە دەربکات کە تائێستاش سەرچاوەیەکی گرنگی نووسەرانەو نرخێکی ئەدەبی‌و مێژوویی زۆری هەیە .

کورد ساغی‌کردوەتەوە کە هەمیشە نایەوی لە کاروانی

شارستانەتی دوورو کلاسیت‌و ئامادەبە هەموو کاتێك هەلی رۆشنبیری بەکاربهێنێ‌و سوود لە هەموو دەرفەتێك وەربگرێت دەنگی زانین‌و هوشیارکردنەوەو ئەدەبیاتی گەل‌دۆست بە گوێی رۆلەکانیدا بگەیەنێت . هەر کاتێك باری سیاسی کەمێك خاو بووبێ‌و دەرفەتی کشانەوەی هێزی زەبروزنگی‌ی کۆنەپەرستی‌و کاتی هەناسەدانی ئازادان بووبێت ، رۆلەکانی کورد قۆلیان لێ‌هەلمالیوەو بەسەد ئەرك‌و ئەزیەتیش بێت رۆژنامەنووسی خۆیان‌کردووە ، خۆ لەسایەی ئازادی‌ودیموکراتیدا ئەوا تا توانیویەتی لە مەیدانی روشنبیری‌و روژنامەنووسیدا چالاکی نواندووە . سەیرکەن لە ماوەی یەك‌سالی تەمەنی کۆماری مەهاباد لەسالی ۱۹٤۳دا نزیکەی (دە) گۆڤارو روژنامە دەرچوو .

هەروەها لە سالی ۱۹٥۸دا دوای بلاوبوونەوەی پرشنگی شۆرشی ١٤ی تەمووز دەرگا کرایەوەو تا سەرەتاکانی سالانی شەصت زیاد لە ٢٥ روژنامەو گو/ڤار دەرچوو ، بۆ یەکەم جاریش حزبەکان روژنامەی سیاسیان بە کوردی دەرکرد ، روژنامەکانی خەبات ، ئازادی ، کوردستان ، رای‌گەل ، بروا نموونەی ئەم جۆرە رۆژنامە سیاسیانەن .

شان بەشانی رۆژنامەنووسیی ئاشکرا لە سالانی جەنگی دووەمی جیهانی‌یەوە ، جۆرە رۆژنامەنووسی‌یەکی تریش لە گۆری‌دابوو کە ئەویش بایەخ‌و نرخی تەواوی خوی هەیەو بریتی‌یە لە رۆژنامە نهێنی‌یەکان ، ئەو رۆژنامانەی دوور لە چاوی سیخورو دامو دەزگا ، پۆلیسەکانی سەردەمی کۆن دەردەچوون‌و رای حزبەکانیان بە گەل دەگەیاند . گرنگیان لە رووی باری سیاسی‌یەوە زۆر گەورەیە ، چونکە خەلکێکی زۆر دەیانخوێندەوەو بەو پەری ئاشکرایی داخوازی‌یە سیاسییەکانیان بە پێ‌ی قۆناغ پیشان ئەدات .

شۆرشی ۳۰/۱۷ تەمووزی سالی ۱۹٦۸ بە سەرکردایەتی حیزبی بەعسی عەرەبی سوشیالیست ، دەرگایەکی تری گەورەی لە سەر بزوتنەوەو پەرەپێدان‌و گەشەکردنی جولانەوەی رۆشنبیری کورد کردەوە ، بەتایبەت پاش بەیاننامەی ئازاری سالی ۱۹۷۰ کە تەوژمی‌و گەشەکردنی روژنامەنوسی . . . بە جارێ خۆی نواند . لەو ساوە تا ئەمرۆ ، ژمارەیەکی زوری گۆڤارو رۆژنامەی هەمە جۆرە دەرچووە ، لەگەلێ چەشنەشارەزایی ، لە سیاسەت ، هونەر ،ئەدەبیات ، پیشەو زانستی‌و کشت‌وکال‌و نەقابەکاری‌و ئابووری‌و . . .تا . . زوربەشیان لە قەبارەو ناوەرۆك‌و دیمەن پۆشتەو دەولەمەندبوون‌و بەتەمەن بوون‌و دانەی زۆر زۆریان لێ‌چاپکراوە . حزبەکانیش شان بە شانی کۆمەلەو رێکخراوە میللی‌یەکان رۆژنامەو گۆڤاری سەربەخۆیان هەبووە .

ئەمەی جێگای بایەخە ئەوەیە شۆرشی ۳۰/۱۷ تەمموز بە سەرکردایەتی بەرێز کاك صدام حسین ، لە مەیدانی پەرەپێدان‌و گەشەدانی رۆژنامەنوسی‌دا دەوری بەرزی نواند . . . و بۆ ئەم مەبەستە دەزگای تایبەتی دانرا . . لەم بوارەدا دەزگای روشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی بالای بەزەتی‌و ئاشکرا دیارە : ئەوەتا روژنامەی هەفتانەی (هاوکاری) نزیکەی (١٤) سالە بە بێ بچران دەردەچێت . گۆڤاری (بەیان) و (رۆشنبیری‌نوێ) و (کاروان) نموونەی رۆژنامە نووسی‌یەکی پێشکەوتوو پەرەسەندوون کە ۲۰ هەزارو ۳۰ هەزاردانەیان لێ چاپ‌دەکرێت .

جۆری چاپ‌کردنی بە ئۆفێست‌و مونوتایب‌و دیمەن‌و نیگاری رەنگاورەنگ‌و نەخشەو رێژەی هونەرمەندانە ، هەموو چوارچێوەیەکی نایابن کە رۆشنبیری‌و ئەدەبیاتی کوردی پێشکەش بە خوێندەواران دەکەن .

برایانی خۆشەویست :

کاروانی پیرۆزی رۆژنامەنووسی کوردی مێژوویەکی وای تومارکردووە کە شایانی ئەوەیە چەندەها کتێب‌و لێکۆلینەوەی لەسەر بنووسرێت ، بۆ ئەوەی هەلویستی جوان‌و رەنج‌و کۆششی رابەرانی پێشین‌و پێشرەوانی نەتەوەکەمان لەم کاروانە شکۆدارەدا یەك‌یەك پیشان بدرێت . پوختەی بۆ چوونی ئێمە لەم‌رووەوە ئەوانەیە :

(یەکەم) رۆژنامەنووسی کوردی بە رادەی یەکەم چەکی تیکۆشان‌و داردەستی بزووتنەوەی نەتەوایەتی ونیشتمانی گەلی کوردبووەو ئەویش وەکو بزووتنەوەکە تووشی ئەرك‌و ئازارو کۆسپی زۆر هاتووەو بە چنگەرنی‌و بە کولەمەرگی توانیویەتی رێگا ببرێت . لەبەر ئەوە ئەو ژمارە گۆڤارە رۆژنامانەی تا ئێستا دەرچوون وەکو ئاوێنەیەك رووداوو بەسەرهاتەکانی ژیانی روناگبیری گەلی کورد پیشان‌دەدەن .

(دووەم) (لە عیراق لە هەموو شوێن زیاتر ماوەی پێشکەوتن‌و گەشەکردن بۆ رۆژنامەنووسی کوردی هاتوەتە پێشەوە) ، بەتایبەتی پاش شۆرشی ۱۷-۳۰ تموز ۱۹٦۰ لە رۆژانی دوای سالانی حەفتاکاندا پەرەسەندنێکی باش لە لایەنی چەندی‌و چۆنیەوە هاتۆتەکایەوەو تکاکارین رۆژبەرۆژ زیاتریش بێت .

(سێیەم)ڕۆژنامەنووسی کوردی زیاتر بە ڕەنجی ڕۆشنبیرانو ڕۆڵەی لە خۆبردووی گەل ژیاونو کەم تا بیشیکیان نەبێ کە هەندێ دامودەزگای ڕەسمی دەری‌کردوون دەنا زوربەی هەرە زۆریان بە پارەو بە یارمەتیو بە بەرهەمی ڕۆڵەکانی گەل بەڕێوەچوون .

بۆ ئەمەش گەلێ ڕابەرو مامۆستای دڵسۆزی وەکو میقداد مەدحەتو عبدالرحمنو ئەمین عالیو جەلادەت بەدرخان پیرەمێردو نوری شیخ ساڵحو سەید حسین موزنیو علاالدین سجادیو گیوی موکریانیو گۆرانو . . . ژمارەیەکی تر ڕەنجی فەرهادانەیان داوە .

(چوارەم) ئەم ڕۆژنامەو گۆڤارانە سەرچاوەیەکی بەکەڵکن بۆ هەموو ئەو کەسانەی بیانەوێ لە ئەدەبیاتی کوردی بکۆڵنەوە ، چونکە بەگشتی بریتین لە دەفتەری ڕەخنەو لێکۆڵینەوەو شیعرو فۆلکلۆرو چیرۆکو ڕۆمانو شانۆیی کوردی . لەبەر ئەمە پاریزگاری کردنی ژمارەکۆنەکانو زیندووکردنەوەیان ئەمەش بە سەرلەنوێ لە چاپدانەوەیان یان وێنەگرتنیان کارێکی پێویستە ، وە بەوچاوە سەیر بکرێن کە ئەمە گەنجینەیەکە لە سامانی نەتەوایەتیمان .

ئێستاش لیستەیەکتان پێشکەش دەکەم بە ناوی ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەی لە سەرەتاوە تا ئێستا بە کوردی دەرچوون ، لە هەریەك لە تورکیا ، ئێران ، عیراقو ، وولاتانی ئەورووپادا لەگەڵ ساڵی دەرچوونیان کە لیستەکە خۆی لە خۆیدا لێکۆڵینەوەیەکی بەراوورکارانە دەخاتە ڕوو .

لە تورکیا

١ – ر . کورد تعاونو ترقی غەزەتەسی – بە کوردیو تورکی ساڵ ١٩٠٨ لەلایەن بنەماڵەی شەزیتیو بەدرخان دەردەچوو .
٢ – گۆڤاری (ڕوژی کورد) ، پاشان بوو بە هەناوی کورڤ ، ١٩١٣ لە ئەستەمبول کۆمەڵەی هیڤی‌کورد دەری‌دەکرد .
٣ – گۆڤاری (یەکبوون) ساڵی ١٩١٣ لە ئەستەمبول بە کوردیو تورکی دەردەچوو .
٤ – گۆڤاری (ژین) ساڵی ١٩١٤ بە کوردیو تورکی دەردەچوو لە لایەن اشرف حمزەو ممدوح سلیم .
٥ – گۆڤاری (کوردستان) ساڵی ١٩١٩ بەپێنج زمان دەینووسی .

ئینجا ڕوژنامەنووسی خەفەکرا ، تا ئەم ساڵانەی دوایی –

٦ – دیجلەو فورات استنبول ١٩٦٢ ·
٧ – گۆڤاری (دەنگی‌تازە) ، لە ئەستەموول ساڵی ١٩٦٦ دەرچوو .
٨ – یەنی ئەکیش ، واتا شەپولی‌نوی ساڵی ١٩٦٦ لە ئەنقەرە دەرچوو
٩ – گۆڤاری (ڕزگاری) ساڵی ١٩٧٦ لە ئنقەرە دەرچوو
١٠ – گۆڤاری (دەنگ) ئەستەمبول ١٩٦٣

لە ئێران

١ – ڕوژی کورد ، شەوی‌عەجەم ، پاشان ناوی کرا بە ڕۆژی‌کورد ، ئنجا تەنیا کورد (سمکۆ) لە ورمێ ساڵی ١٩٢١ دەری‌کردووە .
٢ – کوردستان لە سابلاغ ساڵی ١٩١٤ چاپ‌کراوە
٣ – گۆڤاری نیشتمان – لە تەوریز ساڵی ١٩٤٣ کومەڵ/ی ژ.ك دەری‌کردووە .
٤ – گۆڤاری هاوار ، هاواری‌کورد لە مهاباد ساڵی ١٩٤٥ دەرچووە .
٥ – گۆڤاری کوردستان ساڵی ١٩٤٥ لە مهاباد دەرچووە زمان حاڵی پارتی‌دیموکراتی کوردستان بووە
٦ – گۆڤاری ئاوات – لە مهاباد ساڵی ١٩٤٥ دەرچووە .
٦ ٧ – ڕوژنامەی کوردستان ساڵی ١٩٤٦ دەرچووە لە مهاباد کورگانی پارتی بووە
٨ – هەڵاڵە – ١٩٤٦
٨ – هاواری نیشتمان – لە مەهاباد سالی ١٩٤٦ دەرچووە
٩ – گروگاڵی منداڵانی کورد . لە مەهاباد ساڵی ١٩٤٦ دەرچووە
١٠ – گۆڤاری خۆرنشین – مەهاباد ساڵی ١٩٥١

١١ - گوڤاری راوێژ سالی ١٩٥٢ له ئیران دەرچووه
١٢ - رۆژنامەی کوردستان له باکو سالّی ١٩٤٧ دەرچووه ،
١٣ - رێگا - مهاباد ١٩٤٨
١٤ - کوردستان . تاران .١٩٥٩
١٥ - کوردستان

شام‌و بیروت

١ - رونـــــــــاهی - ١٩٤٢ دمشق
١ - کوردستان - حەلەب ١٩١٥
٢ - رۆژانوو ١٩٤٣ بیروت
٢ - هاوار - دمشق ١٩٣٢
٣ - شێر ١٩٤٣ دمشق
٣ - گوڤاری -راستی - بیروت ١٩٧٣
- رۆژناوی (ریا تازه) له ئەرمینیای یەکێتی سوڤیەتی - تا ١٩٣٠ەوه
- گوڤاری کوردستان له (شاندرلاند) له ئنگلتەره - سالی ١٩٥٨
- پرشنگ - ئەوروپا - سالی ١٩٦٦

عیراق

١ - بانگی‌کورد - بغداد / ١٩١٤
٢ - تێگەیشتنی‌راستی - بغداد / ١٩١٨
٣ - پێشکەوتن - سلیمانی ١٩٢٠
٤ - بانگی‌کوردستان - سلیمانی ١٩٢٢
٥ - رۆژی‌کوردستان -سلیمانی ١٩٢٢
٦ - بانگی‌حەق - سلیمانی ١٩٢٣
٧ - ئومیدی استقلال ١٩٢٣ -سلیمانی
٨ - ژیانەوه - سلیمانی ١٩٢٤
٩ - دیاری‌کوردستان - ١٩٢٥ - بغداد
١٠ - ژیان - سلیمانی ١٩٢٦
١١ - زاری‌کرمانجی - رواندوز - ١٩٢٦ - حسین حوزنی موکریانی .
١٢ - پەیژه - بغداد / ١٩٢٧
١٣ - روناکی - هەولیر / ١٩٣٥
١٤ - ژیان - سلیمانی ١٩٣٧
١٥ - گۆڤاری زانستی - ١٩٣٨ - سلیمانی
١٦ - گۆڤاری گەلاوێژ - بغاد - ١٩٣٩
١٧ - رۆژنامەی ژین - ١٩٣٩ سلیمانی
١٨ - گوڤاری (دەنگی‌گیتی‌تازه) ١٩٤٣ -بغداد
١٩ - رۆژنامەی (هەولیر) ١٩٥٠
٢٠ - گوڤاری (نزار - ١٩٤٨
٢١ - گوڤاری پەیان - بغداد - ١٩٥٢
٢٢ - گوڤاری (هەتاو) -هەولیر ١٩٥٤
٢٣ - گوڤاری (هیوا) ١٩٥٧ بغداد
٢٤ - گوڤاری شفق ، کرکوك . ١٩٥٨
٢٥ - پێشکەوتن (التقدم) بغداد ١٩٥٨
٢٦ - رۆژنامەی خەبات - بغداد ١٩٥٩
٢٧ - رۆژنامەی راستی - موصل ١٩٥٩
٢٨ - رۆژنامەی ازادی - کرکوك بغداد- ١٩٥٩
٢٩ - رۆژنامەی رای‌گەل - کرکوك - ١٩٥٩
٣٠ - گوڤاری رزگاری - بغداد ١٩٥٩
٣١ - گوڤاری نەوروز -سلیمانی ١٩٥٩
٣١ - گوڤاری ئافرەت - بغداد - ١٩٥٩
٣٢ - گوڤاری بلێسه - سلیمانی - ١٩٥٩
٣٣ - هیوای‌کوردستان سلیمانی - ١٩٥٩
٣٤ دەنگی‌قوتابیان - بغداد- ١٩٥٩
٣٥ - رۆژنامەی برِوا - سلیمانی ١٩٦٠
٣٦ - رۆژنامەی دەنگی‌کورد - بغداد ١٩٦٠
٣٧ - گوڤاری رۆژی‌نوێ - سلیمانی ١٩٦٠
٣٨ - گوڤاری چارەسەرکردنی کشتوکال - بغداد - ١٩٦٠
٣٩ - گوڤاری عیراقی‌نوی - بغداد / ١٩٦٠
٤٠ - گوڤاری ژیان - هەولیر ١٩٦٠
٤١ - رۆژنامەی کوردستان - ١٩٦١ بغداد .
٤٢ - رۆژنامەی هەولیر - هەولیر ١٩٦٢ / گوڤاری ئەدبی عیراق / بغداد/ ٩٦١
٤٣ - رۆژنامەی راپەرین - سلیمانی ١٩٦٤
٤٤ - رۆژنامەی دەنگوباس - بەغدا - ١٩٦٦
٤٥ - رۆژنامەی برایەتی - بغداد - ١٩٦٧
٤٦ - سلیمانی ١٩٥٨
٤٧ - کاری‌میللی - بغداد / ١٩٦٨
٤٩ - روناکی - بغاد - ١٩٦٩
٥٠ - رزگاری - سلیمانی - ١٩٦٩
٥١ - بەیان . بغاد - ١٩٦٩

٥٢ - دەفتەری کوردەواری بغداد - ١٩٧٠

٥٣ - گوڤاری هەولێر - هەولیر - ١٩٧٠

٥٤ گۆڤاری برایەتی - بغاد - سالی ١٩٧٠

٥٥ - گوڤاری شورش‌کشتوکال - بغداد - ١٩٧٠

٥٦ - گۆڤاری زانیاری - بغداد - ١٩٧٠

٥٧ - چیا - دهوك - ١٩٧٠

٥٨ - گێتی ی - ١٩٧٠ - بەغدا

٥٩ - گوڤاری خەباتی‌قوتابیان - بغاد / ١٩٧٠

٦٠ - روژنامەی هاوکاری ١٩٧٠

٦١ دووبارە ژین - سلیمانی - ١٩٧٠

٦٢ - دەنگی فەللاح - بغداد - ١٩٧١

٦٣ - روژنامەی برایەتی ، برائی ، ١٩٧٢ ، ٩٧٤ ، ٩٧٥

٦٤ - بیری‌نویٚ ، بغداد / ١٩٧٢

٦٦ گوڤاری دەنگی‌مامۆستا - ١٩٧١ سلێمانی

٦٧ - نووسەری کورد -- ١٩٧١ بغداد

٦٨ - روژی‌کوردستان - ١٩٧١ - بغداد

٦٩ پەروەردەوزانت - بغداد / ١٩٧١

٧٠ - هیڤی . دهوك ١٩٧١

٧١ - دوانکە - بغداد - ١٩٧١

٧٢ - گزنگ - کرکوك - ١٩٧٢

٧٣ - نووسەری‌نوێ - هولیر -- ١٩٧٢

٧٤ - ئەستێرە - سلیمانی - ١٩٧٣

٧٥ - هوشیاری‌ی کریکاران - ١٩٧٢ - بەغدا

٧٦ گۆڤاری کولیجی ئەدەبیات - بغداد - ١٩٧٢

٧٧ - روشنبیری نوێ - بغداد - ١٩٧٣

٧٨ - گۆڤاری کۆڕی‌زانیاری . کورد . ١٩٧٣ - بغداد

٥٩ - باباگورگور . گوڤاری یەکیتی‌قوتابیان کوردستان - کرکوك - ١٩٧٣

٨٠ - ئامانج - بغداد - ١٩٧٤

٨١ - پاشکۆی‌عیراق - ١٩٧٧

٨٢ - زانکو - سلیمانی گوڤاری زانکۆی سلێمانی ئاسۆی زانکۆیی

٨٣ - ئابووری‌زان - هەولێر .

٨٤ - ئانۆ سلیمانی

٨٥ کاروان .


* **شەهیدبوون بەرزترین پلەی قارەمانیەتی‌یە**

# زمان‌و پێوەندی بە مێشکی ئادەمیزادەوە .


غازی فاتح وەیس


١ پێشەکی :

ئەگەر بە وردی بیر لە زمان بکەینەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە دیاردەیەکی سەرسووڕ هێنەرە ! لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەم دیاردەیە دەستنیشان کردنی ناوەرۆك جەوهەری مرۆڤ ئەگرێتەوە . چونکە بنچینەی زمان لە راستیدا مێشکی ئادەمیزاد . دەرخستنی ڕاستی زمان‌و بنچینەکەی (مێشك) مەسەلەیەکی بە یەکداچووی دوو لایەنە چونکە هەر هەوڵدانێك بۆ دۆزینەوەی ڕاستی زمان . باسی یەکێك لە کارە هەرە گرنگەکانی مێشك ئەگرێتە هەروەها ئەتوانین بە شی‌کردنەوەی کاری مێشك . دەستنیشانی لایەنی ڕاستی زمان بکەین .

**بە پێ‌ی ڕای فەیلەسووفی بە ناوبانگ (دیکارت) زمان شێوەی داهێنانە (ابداع) لە ئادەمیزاد . دوا بە دوای دیکارت (ئەنتۆنیۆ لی‌گراند)ی زانا لە شی‌کردنەوەی فەلسەفەی دیکارت‌دا ڕای گەیاند کە هەندێ جۆری مەیموون توانای تی‌گەیشتن‌و قەکردن هەیە . بەڵام لە هەڵسوراندنی ئیش‌و کار . خۆی گێل ئەکا . ئینجا زانای بە ناوبانگی ئەمەریکای‌ی (چۆمسکی) ڕای گەیاند کە زمان تایبەتە بە ئاوەمیزاد ورەگ‌و ڕیشەی لە مێشکی ئاوەمیزادایە . بێ گومان ئەگەر ڕای (لی‌گراند) ڕاست بێ ئەوا ڕای دیکارت‌و چۆمسکی ئەبنە ڕایەکی نەگونجاو . بەڵام ئەگەر**

ئەم جۆرە مەیموونە توانای قسەکردنی هەبێ وە لە ترسدا قسە نەکات ئەوە ئەگەیەنێ کە توانای فێڵ کردنیشی هەیە کە یەکێکە لە ڕەوشتەکانی ئادەمیزاد .

بەم جۆرە ئەم جۆرە مەیموونە ئەگەر لە مرۆڤ زیرەکتر نەبێ ئەوا کەم تر نیە . ئەمە لە لایەك . لە لایەکی تریشەوە . تا ئێستا هیچ دەلیلێکی ڕاستەو ڕاست بە دەستەوە نیە بۆ سەلماندنی ڕای (لێگراند) . کەوا بوو ڕای (لێگراند) هەڵەیە و زمان تایبەتە بە ئادەمیزاد .

لە کۆندا ئادەمیزاد نەیزانی زۆر بە توانایەو خۆی پاشای سەر ئەم زەمینەیە تاوەکو ئەو کاتەی کە بۆی دەرکەووت کە خاوەنی بیرو هۆشێکی بێ هاوتایە . ئاوەمیزاد توانایەتی خۆی لە چەند شتێکدا بەدی کردو زمانیشی بە کارهێنا بۆ دەربڕینی ئەو بیروهۆش و هەستو نەستو توانایەی کە هەیەتی

یەکێك لەو تەنگەو چەڵەمانەی کە زانایانی زمانو کۆمەلایەتیو سایکۆلۆژیو فەیلەسووفەکانی خەریك کردبوو بۆ ماوەیەکی زۆر . وە تا ئێستاش . ئەوە بوو کە چۆن ناوەرۆك جەوهەری زمانو سەرچاوەو بنەوانەکەی یەکالا بکەنەوە

ئەوەی ئاگامان لێی بێو بیزانین دەربارەی زمان ئەوەیە کە مرۆڤ دوای فێربوونی زمان ئەتوانێ چەند شتێك بڵێو خەڵکیکەش لێی تێبگەن . هەر وەها خۆستی لەو شتانە تێبگات کە خەڵکی کە ئەیڵێن . هەروەها بە پێی تاقیکردنەوە . ئەزانین کە بنەوانەی زمان مێشکە . بەڵام ئەو پرسیارەی وەلامدانەوەی ئەوێ ئەوەیە : ئایا ئەو کۆمەڵە (وسیلە)یە چیە کە مرۆڤ بەکاری ئەهێنی بۆ دەربڕینی بیرو هەست وەچۆن ؟

لەم باسەدا زمانو بەشەکانی ی ڕوون ئەکەینەوەو لە چۆنیەتی کارکردنی مێشك ئەکۆڵینەوە

٢ ناساندنی زمان

یەکێك لەو دیاردە جۆر بە جۆرانەی کە مرۆڤ هەوڵ ئەدا بەشەکانی کۆبکاتەوەو ئینجا شیان بکاتەوە . زمانە . زمانیش - کە بەشێکی جیانەکراوەیە لە ئادەمیزاد بە جۆرەها شێوە ناسێنراوە یەکێك لەو شێوانە ئەوەیە کە زمان بریتی‌یە لە کۆمەڵێك دەستوور . هەندێ لەم دەستوورانە گشتین‌و هەندێکی کەیان تایبەتین . ئەوەی گشتی‌یە . وبەسەر هەمو زمانەکانی گێتی‌دا ئەچە سپێنرێ . بۆ نموونە دەستووره کانی فۆنەتیك (Universal Phonetic RulesA وەیا ئەو گرامەرەی دیی گرامەری گشتی (Universal Grammar) . بەڵام ئەو دەستوورانەی کە تایبەتین . بەسەر یەك زماندا ئەچەسپێنرێن . بۆ نموونە دەستوورەکانی فۆنۆلۆژی (Phonological Rules) وەیا دەستووره تایبەکان ( Specific Rules) . واتە هەمو زمانێك چەند دەستوورێکی تایبەتی خۆی هەیەو لە هی زمانەکانی کە جیاوازترە . لە لایەکی کەوە . زمان ئەو پێوەندیيە تایبەتە ئەگرێتەوە کە لە نێوان دەنگو واتادا هەیە وەمرۆڤ ئەتوانێ بە بە کارهێنانی چەنە کەرەسەیەکی دیاریکراو وەیا سنووردار (پیتو دەنگ ) . جۆرەها واتای بێ سنوور دەربرێ وەیا زمان بەوە ئەناسرێت کە بریتیە لە چەنە کۆمەڵێك کەرەسە . هەر کەرەسەیەکیش کاتو شوێنو کارگێڕانی تایبەتی خۆی هەیەو مرۆڤ یە کاریان ئەهێنێ بۆ دەربڕینی ئەو بیرەی لە مێشکیدایە . بە لام ئەگەر جۆرە دەستووری یاسایەك نەبێ دەنگو واتا وەیا کەرەسەکان بەیەکەوە بیەستی ئەوا بێ گومان هەمو ناساندنێك ناتەواو دەرئەچیو زمانیش بە بێ دەستوورو یاسا ناتوانرێ پێی بووترێ زمان

٣ دابەش کردنی زمان

بە شێوەیەکی گشتی زمان دابەش ئەکرێ بەسەر دوو بەشدا

یەکەم : زمانی قسەکردن (Spoken Language)

دووەم : زمانی نووسینەوە (Written Language)

کاغەز یەکێکە لەو ئامرازانەی کە بیری مرۆڤ ئەخرێتە سەرو بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەبەردەستدا ئەمێنێتەوە لە شێوەی نووسین‌دا لە زمانی قسەکرندا هەوا ئامرازێکی گرنگی گەیاندنی بیرە . وەئەو بیرەی تێکەل بە هەوا ئەکرێ تەنیا بەسە گرنگەکەی لە مێشکدا ئەمێنێتەوە ئەوەی گرنگ نیە یەکسەر لەناو ئەچێ . کەوا بوو نووسینەوە بۆ پاراستنی بیرە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژو قسەکردن بۆ ماوەیەکی کورتە . بەڵام بنەوانەی هەردووکیان مێشکە .

زمان لە سەرەتای دروستبوونیەوە وەکو بیرێك لە مێشکدا تاوەکو ئەو کاتەی ئەخرێتە سەر کاغەز وەیا تێکەڵ بە هەوا ئەبێ رئەکرێت بە چەند بەشێکی جیاوازەوەو هەر بەشێك لەم بەشانە شێوەو ناوەرۆکو دەستوورو یاسای تایبەتی خۆی هەیە .

بۆ نموونە گرامەری هەر زمانێك بریتیە لە دەستووری ئەم بەشانەی خوارەوە :

١ سیمانتیك (Sematics) – دەستوورەکانی واتای زمان ئەگرێتەوە

٢ سینتاکس (Syntax) – دەستوورەکانی چۆنیەتی دروستکردنی رستە ئەگرێتەوە

٣ – مۆرفۆلۆژی (Morphology) = دەستوورەکانی چونیەتی دروستکردنی برگە ئەگرێتەوە

٤ فۆنۆلۆژی (Phonology) = دەستوورەکانی چۆنیەتی لکاندنی فۆنیمەکان ئەگرێتەوە بۆ دروستکردنی برگەو وشە

٥ فۆنەتیك (Phonetics) = دەستوورەکانی چۆنیەتی دروستکردنی دەنگ ئەگرێتەوە بەلام ئەوەی شایانی باسە دەستوورەکانی فۆنەتیك بە دەستووری گەرامەر ناژمێررێ . بەم جۆرە گرامەر بریتی‌یە لە دەستوورەکانی ئەو چوار بەشەی سەرەوە بە بێ دەستوورەکانی فۆنەتیك

لە رووی لێکۆڵینەوەی زمانەوانیەوە لە رووی دابەشکردنی جۆری لێکۆڵینەوەوەو پێوەندی هەر بەشێك بە زانستەکانی ترەوە زمان ئەتوانرێ بکرێت بەم چەند بەشەی خوارەوە :

١ زانستی فێرکردنی زمان (Applied Linguistics) بریتی‌یە لەو رێبازانەی کە بۆ فێرکردنی زمان رەچاو ئەکرێ‌و پەیرەوی ئەکرێ .

٢ زانستی زمانو سایکۆلۆژی (Sycholinguistics) لە پێوەندی نێوان زمانو دەروونی مرۆڤ ئەکۆڵێتەوە

٣ زانستی زمانو کۆمەڵایەتی (Sociolinguistics) لە پێوەندی نێوان زمانو دیاردەکانی کۆمەڵایەتی ئەکۆڵێتەوە

٤ زانستی زمانو ئەنترۆپۆلۆژیا : (Anthropological) لە پێوەندی زمانو رەگەزی ئادەمیزاد ئەکۆڵێتەوە .

٥ زانستی زمانو فەلسەفە (Philosophical Linguistics) لە پێوەندی نێوان زمانو فەلسەفە ئەکۆڵێتەوە

٦ – زانستی زمانو شێوەی نووسینەوە (Stylistics) لە پێوەندی نێوان زمان شێوەی نووسینەوەی ئەدەبی ئەکۆڵێتەوە .

٧ زانستی زمانو ماتەماتیك (Mathematical Linguistics) لە پێوەندی نێوان ماتەماتیك ئەکۆڵێتەوەو بەکارهێنانی کۆمپیوتەر بۆ ئەم مەبەستە .

هەمو بەشانەی کە ناومان بردن ئەتوانین بەم جۆرەی خوارەوە وێنە بکێشین




وێنەی یەکەم : زمانو بەشەکانی

هەر بەشێك لەم بەشانە لە لایەنێك لە لایەنەكانی زمان ئەكۆڵێتەوەو ئەین بە چۆرەها بەشی بچكۆڵەی كەوە .

بەلاَم زانستی دەنگ (Phonetics) زانستێكی جودایەو بە شێوەی ڕاستەقینەی زمان لە قەڵەم ئەدرێ‌و تێكەڵ بە زانستی فیزیك ئەبێ لە لایەكەوەو تێكەڵ بە زانستی بایەلۆژیا ئەبن لە لایەكی كەوە . لەڕووی تێكەڵ بوونی ئەم زانستە لەگەڵ فیزیكدا ئەبێ چۆنیەتی سشی‌كردنەوەی شەپۆلەكانی هەواو لەرینەوەی (ذرات)ی هەوا یاسای فیزیكی بەسەردا بچەسپێنرێ . هەر وەها لە ڕووی بایەلۆژیەوە ئەبێ لە ماسولكەكانی ئەندامەكانی دروست دەنگ بە شێوەیەكی بایەلۆژی بكۆلرێتەوەو شی‌بكرێتەوە .

٤ - ئادەمیزاد زمان :

هەمو مرۆڤێك خاوەنی دوو جۆرە زانیاریە :

یەكەم : زانیاری كەون (Universe) . ئەم زانیاریە برێتیە لە شتی وردیا كەرەسەی هەست پێ‌كراو وەیا ئەو كەرەسانەی كە دەستی ئادەمزادی پێ‌گەیشتوە وەیا بینیویەتی وەیا شتێكی دەربارەی بیستووە .

دووەم : زانیاری زمان : مرۆڤ دوای لە دایك بوونی بە ماوەیەك ئەبێتە خاوەنی زمانێك وە بە پێ‌ی ئەو زمانە لە زانیاری كەون ئەكۆڵێتەوەو لێ‌ی تێ‌ئەگا بەلاَم لە هەردوو حاڵەكە كەوا تێ‌گەیشتن وزانین لە كەمەوە بەرەو زۆر دەست پێ ئەكات . ئەگەرچی تێ‌گەیشتن‌و زانین لە زانیاری یەكەمدا بە شێوەیەكی تەواو زۆر زەحمەتە بەلاَم لە زانیاری دووەمدا شێوەی تەواو نسبیە (بۆ تەنیا یەك زمان) وە مێشكیش لێ پرساوە بەرانبەر بە زیادكردنی كەم بەرەو زۆر .

مرۆڤ . یەكەم‌فێری دەستووری زمانێك ئەبێ‌و دوا بە دوا فێری دەنگ‌و پیتی ئەو زمانە ئەبێ .واتە مێشكی منال دەست ئەكا بە تۆمار كردنی ئەو دوو زانیاریە لە بچووكترین بە شیەوە ناوەكو گەورەترین بەش بە پێ‌ی بینین‌و بیستن ئینجا دەربرین بە شێوەی نووسین‌و قەكردن وەئەگەر مێشك لە پێش هەمو شتێكدا دەستوورو یاسای زمان تۆمار نەكات ئەی بۆ چ ئێمە بە ئاسانی‌ناتوانین زمانێكی بێگانە فێربین لە كاتێكدا تا ڕادەیەك ئەتوانین دەنگەكانی ئەو زمانە بدركێنین ؟ وەدیسان بو چ ناتوانین بە ئاسانی ڕستەی زمانێكی بێگانە بە تەواوەتی بنوسینەوو ئەگەر چی كۆمەڵێك لە وشەكانی ئەو زمانە ئەزانین ؟ وە دیسان بو چ ناتوانین بە ئاسانی لە هەموو قسەكردنێك تێ-بگەین بە زمانێكی بێگانە پاش فێربوونی ئەو زمانە ؟ هەر وەها بۆ چ كاتێ داوا لە منالێكی بچووك ئەكەین شتێكمان بۆ بێنێ بە ئاسانی ئەو كارە جێ بە جێ ئەكا یە بێ ئەوەی بتوانێ قسە بكات ؟ . ئایا ئەم پرسیارانە ئەوە ناگەیەنێ كە مرۆڤ پێش هەمو شتێك دەستوورو یاسای زمان فێر ئەبێ ؟

بۆ ڕوون‌كردنەوەی كاركردنی‌و بینیانی زمان با سەیری ئەم هاوكێشانەی خوارەوە بكەین :

| زمان | ژمارە لێكدراوەكان | ئەنجام |
|---|---|---|
| زمانی یەكەم | ١ + ٢ + ٣ + ٤ = | ١٠ |
| زمانی دووەم | ٤ + ٢ + ١ + ٣ = | ١٠ |
| زمانی سێیەم | ٢ + ١ + ٣ + ٤ | ١٠ |
| زمانی چوارەم | ١ + ٣ + ٤ + ٢ = | ١٠ |

. . . . .

بە پێ‌ی ئەو هاوكێشانەی سەرەوە ئەتوانین ئەم ئەنجامانەی خوارەوە وەدەست بێنین :

١ - ئەگەر ژمارەی دەنگ‌و پیتەكان لە عالەمی زماند چوار بێ . ئەوا ژمارەی زمانەكانی دونیا بە گوێرەی ئەو هاوكیشانە ئەبێ كە بەو چوار پیتە وەیا دەنگە دروست ئەكرێ لە كاتێكدا ئەنجام یەك ئەبێ . وە هەر زمانێك دەستووری تایبەتی خۆی ئەبێ لە شێوەی هاوكێشێكدا .

٢ - لە ناو هەر زمانێكدا تێ هەڵكێشانێكی ڕاست‌و چەپ دروست ئەبێ بۆ دروست‌كردنی وشەو ڕستە ئەمەش لە شێوەی دروست‌كردنی وشەو ڕستەی لێكدراودا دەرئەكەوێ . كە ئەتوانرێ لە بچومكترین كەرتی زمانەود دەست پێ بكرێ تا ئەگاتە ڕستەو وشەی لێكدراو ئینجا گەڕانەوە بۆ بچووكترین كەرت .

هەر ژمارەیەك لە هەر هاوكێشێكدا تەمسیلی دەنگێك وەیا پیتێك ئەكا وە بە لێكدانیان ئەتوانرێ وشەو ڕستە دروست بكرێت‌و ئەنجامیش یەك بێ .

بۆ نموونە وشەی «كور» لە زمانی كوردیدا برێتیە لە سێ پیت وەیا دەنگ . [ك] [و] وە [ر] هەر وەها لە زمانی ئینگلیزیشدا برێتی‌یە لە سێ پیت (O) (S) (Son) وە (n) . لێرەدا ئەتوانرێ ئەم دوو هاوكێشە دانرێ .

هاوكێشی یەكەم : (A) ١+٢+٣ = ٦ بۆ كوردی

(B) ١+٢+٣ = ٦ بۆ ئینگلیزی

لەم دوو زمانەدا هاوكێشەكان بە گوێرەی زمان جیاوازن

بەڵام بە گوێرەی لوجیك (Logic) یەکن چونکە دەنگەکان نەك نە رووی ژمارەوە بەڵکو لە رووی چۆنیەتی دەربرینیانەو جیاوازن بەڵام واتا لە هەر دوو زمانەکەدا یەکە .

٣ - چەند ژمارە زۆر بوو ئەوەندە هاوکێش زۆر ئەبێ بەم جۆرە چەند دەنگ وەیا پیت زۆر بوو ئەوەندە دەستوورو یاسا زۆر ئەبێو ئەبێتە هۆی دابەش بوونی زمان .

٤ - ئەگونجێ لە دوو زماندا هەمان کۆمەڵە دەنگ وەیا پیت بە یەکەوە بێنو دوو جۆر واتا ببەخشن . بۆ نموونە لە زمانی کوردیدا دەنگەکانی وەیا پیتەکانی وشەی «رووت» لە هەموو رەوویەکەوە وەیا دەنگەکانی وەیا پیتەکانی وشەی (root) ئینگلیزیە کە بە واتای «رەگ» وەیا «ریشە» دێت . لێرەدا ئەتوانین ئەم دوو هاوکێشە دابنێین :

هاوکێشی دووەم : ١+٢+٣ =٦ (A) بۆ کوردی

١+٢+٣+ = ٦ (B) بۆ

ئینگیلیزی

لەم هاوکێشەدا (A) و (B) حزانە تەنشت ئەنجامەکانەوە ئەویش بە پێچەوانەی هاوکێشی‌یەکەمەوە . چونکە لەم دوو هاوکێشەی دواییدا ژمارەکان یەکن هەر وەها دەنگەکانیش هەر یەکن بەڵام ئەنجام بوو بە دوو کەرتەوە ئەگەر چی دیسان لە رووی زمانەوە جیاوازن بەڵام بە گوێرەی لوجیك واتا هەر واتایە . ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە لێکدانێکی راستو چەپ هەیە لە زمانەکانی دوونیادا .

٥ لە هەر زمانێکدا چەند تیپێكو دەنگێك هەیەو ئەتوانرێ سنووریان بۆ دابنرێ وە بە بەکارهێنانیان ئەتوانرێ ئەوەندە رستە دروست بکرێ کە هەرگیز نەتوارێ سنووریان بۆ دانبرێ بۆ دەربرینی ئەو زانیاریەی کە لە کەونداییە .

٦ - کارکردنی مێشكو ئەندامەکانی دروست کەری دەنگ .

ئەو جیاوازیە سەرەکی‌یەی کە لە نێوان ئادەمیزادو ئاژەڵدا هەیە ئەوەیە کە مێشکی ئادەمیزاد لە رووی پێکهاتنو خاسیەتەوە لە مێشکی ئاژەڵ جیاواز ترە بەم جۆرە ئادەمیزاد توانای داهێنانو دروستکردنیو بیرکردنەوەو جیاکردنەوەی هەیەو خاوەنی زیرەکی‌یەکی بێ هاوتایە .

دوکتۆر (جوان هۆرات)ی ئیسپانی [1] بۆ تەفسیر کردنی مێشك ئەڵێ ئادەمیزادا دوو هێزی هەیە کە توانای دروستکردنی هەیە . یەکێکیان لەو هێزە ئەچێ کە لە ئاژەڵو رووەکدا هەیەو ئەوی کەش لە (رۆمە) دایە وەهەر وەها دوکتۆری ناوبراو زیرەکی ئەکا بە سێ بەشەوە .

١ - زیرەکی فێربوون : توانای فێربوون لە ئادەمزاددا گەورەترە لە ئاژەڵ فێربوونی زمانیش یەکێکە لەو توانا بێ هاوتایە .

٢ - زیرەکی ئاسایی : ئەم جۆرە زیرەکیە لە رادەی تاقکردنەوە دەرئەچێتە دەرەوە وئادەمزاد ئەتوانی شت دروست بکات لەو جێگایەی کە زانیاری سەرتوێژی بەستووەو ئەتوانی شتی تازەی کە دروست بکاتو هەست بکاتو بە زمان دەریان ببرێ .

٣ - زیرەکی (تصور) کردن : ئەم جۆرە زیرەکی‌یە لە رادەی زیرەکی ئاسای دەرئەچێتە دەرەوەو مرۆڤ ئەتوانی (تصور) بکات تا رادەی شێتیو ئینجا دەربرینی بە پێی زمانو مێشکیش جڵەوی هەمو کارێکی مرۆڤی بە دەستەوەیە .

بێ گومان مێشك ئامێرێکی زۆر گرنگە لە ئادەمزادا . ئینجا با بزانین مێشك چۆن کار ئەکا .

ئەو بیرەی کە دروست ئەبێ بە لێکدانی ئەو دوو زانیاری‌یە هەمو بەشەکانی زمانی تێدایە تەنیا بەشی فۆنەتیك نەبێ . ئەو بیرەی کە لە مێشکەوە دەرئەچێ بریتیە لە کۆمەڵێك فەرمانو لە هەمو شتێکی کە خێراترە . بگرە لە تیشکیش خیراتر ئەروات ئەم کارە پێی ئەوترێ کاری کارەبای (Electrical Process) . وە ئەو کارەی کە ئەندامەکانی دروستکەری دەنگ پێی هەڵئەستن بریتیە لە جێ بە جێ کردنی فەرمانەکانی مێشكو پێی ئەوترێ (Mechanical Process) وەئەبێ جوڵانەودی ئەندامەکانی دروستکەری دەنگ بکات بەو فەرمانەی کە لە مێشکەوە دەرئەچی وەئەگەر وانەبێ قسەکەرەکە نووشی هەڵە ئەبێ لێرەوا. ئەبێ مێشك ئاگاداری‌ی جوڵانەوەی ئەو ئەندامانە بکات واتە ئەبێ گونجاندنێك هەبێ لە نێوان هەردوو کارگێرانەکەدا .

هەر وەها لە مێشکدا جیاوازیەك هەیە لە نێوان قسەکردنو نووسینەوەدا مرۆڤ بە ئاسانی ئەتوانی بیرەکە لە نێوان بەشەکانی مێشکدا بسوورێنەوە بە ئارەزووی خۆی لە کاتێکدا کە شتێك ئەنووسێتەوە تاوەکو ئەگاتە ئەو رادەیەی کە قایل ئەبێ بە دەربرینەکە بە نووسینەوە . بەڵام لە کاتی قسەکردندا ئەو جۆرە هەڵسووراندنە رووناداات بەو جۆرە بەڵکو کاتێ فەرمانەکە لە مێشکەوە دەرئەچێ ئەبێ یەکسەر ئەندامەکانی دروستکەری دەنگ جێ بە جێ‌ی بکەن وەهەر گۆرانێك هەبێ ئەبێ بە




فەرمانێکی کە جیّ بە جیّ بکرێت وەبە شێوەبەکی زۆر خێرا . بەم جۆرە کاری نووسینەوە جۆرە دواخستنێکی تێدایە بەلاّم لە قسەکردندا جۆرە خێراییەکی تێیدایە لە کاری یەکەمدا (نووسینەوە) مێشك بە ئەسپای کار ئەکاو هێزێکی ئەوتۆی لە سەر نیە بە پێچەوانەی قسە کردنەوە .

پەراویزەکان

١) – بروانە لاپەرە (٩) ی کیتێی (Language and mind)

سەرچاوەکان :


1 — Chomsky. N. (1972) Language and mind.

2 — Aitchison. Y. (1978) Linguistics.

3 — O,connor. Y. (1977) Phonetics.

دەمێ من گۆتارەك لسەر سترانبێژێ هێژا حەیدەر باجلوری دگۆڤارا رەوشەنبیری‌یا وی‌دا (هژمار ۹۷) بەڵاڤکری ، من باور ھەکر دێ ھندەك سەر قەلەمەك جارەکا دی لسەر سترانبێژەکی یان سترانبێژەکا دیا هندابوی بدەست من کەڤن . کووچکا ستران و لاڤژێد کوردی پێ رەوشەنتر و خانەدانتر کەڤیت ، حەتا ئەڤ ڕێزکە هێدی هێدی لسەر (زەما شکاك) دیاشەمزینکا من‌دا روژەکێ خڕبوین .

# زەما شکاك

عبدالرحمن مزوری

ناڤێ وێ (زومەیران) ە ، بەلێ دناڤ کوردادا ناڤدێرە (بزەما شکاك) یان هەر (زەمێ) بتنێ .

(زەمێ) دگەل مشەختی‌ێد جەنگا جیهانی‌یا یەکێ ژەرۆکا رۆژهەلاتی ژبەر ئویرسی رەڤ بو . . حەتا گەهشتی‌یە دەشتا بەرینا دوبانێ لناڤ گوندێد سلیڤانەیا . ئاسیهێ و ئەرمشتێ و بێزهێ و قادیا . . . ژوان گوندانە ئەوێد (زەمێ) چویێ و دیتین و تێدا هەیامەکێ ژیای .

هێژا حەجی عەمەرێ بێزهی کو سالا ۱۹۰۰ ز ژدەیکبویە و ئەڤرو سالا ۱۹۸۳ز ژیێ وی بدرستی (۸۳) سالن ، دبێژیت من (زەمێ) چاك دیتی‌یە : ژنەکا بخوڤە و بلند بو . . دێم خڕ و ژنهاتی دابێژی (ئاغا ژنە) . . ویگاڤێ زەم دژیێ (٤٠) سالیێ‌دا بو ، کو ئەز چاردە - پازدە سالی‌بوم . . ڤەشارتیێ چەل و چیا ژبەر (سەفەر بەرلکا) مێژویێ .

ئانکو مرۆڤ دکاریت بێژیت (زەم) ددەور و بەرێد سالا ۱۸۷۵ز هاتی‌یە دنێ و سالا مرنا وێ (ئەڤرو) نە گەلەکا روهنە .

(زەم) هەیامەکا باش لدەڤەرا بادینان مایە . . لدەهوات و خوشی‌یا ، لزێمار و تەحلی‌یا ، ستران گوتینە . . حەتا دکووچك و دیوانێد گەلەك ئاغا و میرەکێد دەڤەرێدا ژی گوتینە . وەکی کووچکا عەرەب ئاغایێ سلیڤانەیێ لگوندێ (خربە نویرێ) و محمد ئاغایێ زاخویی و شەکر ئاغایێ گراڤی و سعید ئاغایێ کوولی . . حەتا وەلێ هات سترانێد وێ بەلاڤبون و کەتنە ناڤزارا و خەلکی بخو ژێگرتن و بزارڤەکرن ، وەکی سترانبێژێ ناڤدێر زوبەیرێ محو رەشووا یێ هاجانی ، کو خەلکێ ئاسیهێ بو ، دگەل مودیر ناحیێ ویرێ بەری جەنگێ دەخل دپیڤان و خویلك دستاندن . . ئەڤی (زوبەیری) گەلەك سترانێد وێ دزانین و دگوتن ، مخابن ئەڤرو نەمایە و هەمی دگەل خو برن . ئەم نزانین (زەمێ) کەنگی چویە بەر دلوڤانیا خودێ . . ؟ ! چونکی وەسا یابەلاڤە کو ئەو جارەکا دی دگەل (ئەسمیخانا) فامليا شەکر ئاغایێ گراڤی ، ڤەزڤری زوزانا و سالوخێد وێ ئێدی ژمە هاتنە برین . یازانایە کو هندەك مشەختێد جەنگا جیهانی‌یا یەکێ پشتی هەیامەکا چاك لبادینان ماین زڤرینە جهێد خو ژوان بنەمالا شەکر ئاغایێ کورێ عەمەر ئاغایێ گراڤی [1] ژکوچەرێد ئەرتوشیا بهەردو کورێد خوڤە لەزگین و بابەکر ئاغای .

وە دیارە (زەمێ) گەلەك بدلێ خێزانا وی (ئەسمیخانێ) ڤە نویسیایە لەورا دگەلەل خو زڤراندی‌یە زۆزانا .

ئەڤەژی قەفتەك ژسترانێد (زەما شکاك) کو مە ژزاردەڤێ هێژا حەجی عەمەرێ بێزهی (۸۳ سالی‌یە) رۆژا شەمبی ۱۹۸۳/۹/۳۰ز تومارکرینە .

## ۱ - جەواهرێ

دێ رابە جەوێ جەواهرێ
بەژنا تە زراڤە تیرەکا .
لبەر چادرێ
ئەزێ رابم دەستێ جەواهرا سەلمێ
بگرم وبرەڤینم
بیەم دەشتا نەوجانێ خانا (تەپیر گورێ) [2]
دێ رابە جەوێ جەواهرا

رەزیلیێ تو عەزیزا باڤ‌وبرا
ئەزێ رابم دەستێ جەواهرا سەلمێ
بگرم وبرەڤینم
ببەم دەشتا نەوجانێ
لناڤ هەرچەند مالێد موهاجرا
دێ رابە جەوێ تورین جەوێ
تو خەزالا چولا چاڤ ل‌خەوێ
پشتی جەواهرا سەلمێ
لناڤ عەشیرێد کوردا
من کەس نەڤێ
دێ رابە جەوێ ئەز چبکەم ژڤی بەختی
من جەواهرا سەلمێ دیت‌و
بتەنا کراسێ مەلەسی
لسەر تەختی
طالع‌و بەختێ من‌و جەواهرا سەلمێ
هەرچەند مالید مەسێڤیلا
بون مشەختی
دێ رابە جەوێ تورین جەوێ
تو خەزالا چولا چاڤ ل‌خەوێ
پشتی جەواهرا سەلمێ
لناڤ عەشیرێد کوردا
من کەس نەڤێ

## ٢ - حوسێنێ حەرو

دە وەیلو . . دە وەیلو حوسێنوبرا
مەشەرەکێ دانی لروژا ئەینێ
مە هێلەکا دانی لروژا ئەینێ
سوارێد مالا بابێ من سواربون
پەیاکەتن ل‌کوسکا خویانا
ڤێ کەمینێ
ئەزێ دەستێ خو دلەشێ حوسێنێ حەرو دگەرینم
هەرچار تلێد من مەشیان
خویانا دەڤێ ڤێ برینێ
دە وەیلو . . . دە وەیلو حوسێنوبرا
مەشەرکێ دانی لکرێتی‌یا رەنگین بکنێرو
ژمالا خوێلدێ ناسر سیاربون ،
ژنو مێرو
چوبون پێشی‌یا حوسێنێ‌برا ، بابێ ئەحمەد
ئێکك سوێرو (٣)
چەوا نرێنێد حوسێنێ حەرو لمن‌تێن
مینا نرێنێد عەلی شێرو
دە وەیلو . . دە وەیلو حوسێنوبرا
ڤا خوش‌مێران وعەگیدان شەر پەیداکر
قەلسە مێرا پالێ خودا کێڤرا (٤)
جهێ خو تەناکر
حەیفا منا دکەڤێ عەگید وخوش‌مێرا . .
خودا کوژتنێ
قەلسە مێرا ژنێد وان بتەناهی
ل‌خو مارکر

## ٣ - یار یار

دە یار یار میرێ من یار یار
من سوندەکا خاری بیاسینێ
سوار نابم ڤێ پایتونێ وڤێ پانزینێ (٥)
ناچم بەدلیا شەوتی
وقەبول ناکەم ئەمرێ دەولەتێ‌و
ڤێ قانوینێ
دە یار یار میرێ من یار یار
من سوندەکا خاری بفورقانە
ناچم بەدلیسا شەوتی بدوکانە
خودێ خراب بکەت مالا مأمورێ دەولەتێ
دەستێ میرێ من
سیارێ‌بەشو ، بابێ مویسا بەگێ ، گولا وەلاتا
گرتبو دارێ کەلامچێ
بەرێ وی دابو کورکا ئەرزەروێمێ
ئەز قەبول ناکەم ئەمرێ دەولەتێ
واستنطاقا ڤان فەلانە
دە یار یار میرێ من یار یار
من سوندەکا خاری بشێلاهی‌یە
ناچم بەدلیسا شەوتی وا ب‌بی‌یە
خودێ خراب بکەت مالا مأمورێ دەولەتێ
دەستێ میرێ من

سیاریٚ بەشو ، بابیٚ مویسا بەگیٚ ، گولا وەلاتا
گرتبو داریٚ کەلامچیٚ
بەریٚ وی دابو کورکا ئەرزەرۆمیٚ
ئەز قەبول ناکەم ئەمریٚ دەولەتیٚ
ئەمریٚ دەولەتا ئوسمانلی‌یە
دە یار یار میریٚ من یار یار

## ٤ – طاهر خان[٦]

ئەزیٚ بقلێنی‌یا رەنگین کەتم سەر سیٚ گرا
تڤەنگا ددەستیٚ طاهرخانی
کەکیٚ زەرزیٚ ، بابیٚ جەمیلی ،
دشوغلی مینا خویانیٚ
پێت وچرا
عەسکەریٚ گاور ماکوا عەجەمیٚ گرانە . .
ئەڤرو شەریٚ کەتی‌یە سەر ملێد
هەردو برا
ئاغاوو بەردیٚ
میریٚ من بەردیٚ
جەلەبا گاور عەجەمیٚ گرانە ،
پاڤیٚ سەر زەندیٚ
عەسکەریٚ ماکوا عەجەمیٚ دەرباز بکە ،
حەیا خویانا مەلازکەندیٚ
ئەزیٚ بقلینی‌یا رەنگین کەتم ب‌پاوانە[٧]
عەسکەریٚ ماکوا عەجەمیٚ گرتی ،
دیوان ودیوان خانە
هەچی پیسیٚ چەپەلیٚ لقوورە بارگیرەکی سواربو . .
ل‌ئورتا مەیدانیٚ سەکنی
پشتی بابیٚ زەرزیٚ ، کەکیٚ جەمیلی ،
ئاپیٚ رەڤیایێ دبێژن :
ئەم ئاغانە ! !
ئاغاوو بەردیٚ
میریٚ من بەردیٚ
عەسکەریٚ ماکوا عەجەمیٚ دەرباز بکە ،
حەیا خویانا مەلازکەندیٚ
ئەزیٚ بقلینی‌یا رەنگین کەتم وا ب‌بیە
عەسکەریٚ ماکوا عەجەمیٚ گرانە . .

کەتین کوسکان وتابی‌یە
جابەکا خێریٚ هاتی
هند دبێژن بابیٚ زەرزیٚ گرتی‌یە .
هند دبێژن ویٚ کوژتی‌یە
من سەد حەیف ومخابنی جوانی‌یا بابیٚ زەرزیٚ ؛
کەکیٚ جەمیلی ، ئاپیٚ رەڤیایێ
لسەر سینورێد عەجەما حیلە حیلە ،
بیٚ خوەبی‌یە
ئاغاوو بەردیٚ
میریٚ من بەردیٚ
جەلەبا گاور عەجەمیٚ گرانە ،
پاڤیٚ سەر زەندیٚ
عەسکەریٚ ماکوا عەجەمیٚ دەرباز بکە ،
حەیا خویانا مەلازکەندیٚ

## ٥ – محدیٚ زەری

محمدی لاوو ئەزیٚ ناچم باطنائیٚ ،
لسەری کەندیٚ
ویٚ لمن خوش‌تیٚ ،
دەنگی بلبلی وکەوی بەندیٚ
ئەز ناکەڤم حەیفا کوژتنا مێرا . .
حەیفا منا دکەڤی سەر ویٚ حەیفیٚ
بەریٚ کوچەریٚ بابیٚ (زەریف خانیٚ)
دابو سەر بازاریٚ (مەلاز کەندیٚ)[٨]
نابی محمدو نابی
من چەندجارا گوتە تە شەریٚ رومیٚ‌گرانە ،
شەر ڤێرا نابی
محمدو لاوو ئەزیٚ ناچم باطنائیٚ ،
لسەریٚ ملی
ویٚ لمن خوش‌تیٚ ،
دەنگیٚ کەوا و ڤی بلبلی
ئەز ناکەڤم حەیفا کوژتنا مێرا . .
حەیفا منا دکەڤی سەر ویٚ حەیفیٚ
بەریٚ کوچەریٚ بابیٚ زەریف‌خانیٚ
دابو سەر بازاریٚ (رەش تونجەلی)[٩]
نابی محمدو نابی

من چەندجارا گۆتە تە شەڕێ رومێ گرانە ،
شەڕ ڤێرا نابی
محمدو لاوو ئەزێ ناچم باطنائێ ،
لسەری گازێ
وێ لمن خوشتێ
دەنگێ بلبلی وسەوتا قازێ
ئەز ناکەڤم حەیفا کوژتنا مێرا . .
حەیفا منا دکەڤی سەر وێ حەیفێ
بەرێ کوچەرێ بابێ زەریفخانێ
دابو سەر بازارێ (تەشیر بازێ) (١٠)
نابی محمدو نابی
من چەندجارا گوتەتە شەڕێ رومیگرانە ،
شەڕ ڤێرا نابی

## ٦ – لێ دابێ

لێ دابێ . . لێ دابێ
منو دیاری شەڕێ خوبانا ڤێ بەرێ
زەندێ بابێ جەمیل گولێ سیارا بریندارە
ناگرت سەروگو هێد ،
خوبانێ حەمدانیی (١١)
شادان وشوهیدێد بابێ جەمیل
گولێ سیارا گەلەکن
سێجا هێرشکری سەر چەپەرێ خوەبێ
عەینەلیی (١٢)
ئەز ئێنسیرا بابێ جەمیلم
گوینا سیارێ حەمداینێ
ئەز بەتنێ
لێ دابێ . . لێ دابێ
بەژنا بابێ جەمیلی روحانا نرگزکری
منێ گێراندبو بازێر بازێر . .
ژکەیفا دلێ خوەرا قورمزکری
شادان وشوهیدێد بابێ جەمیل گەلەکن
روژا شەڕێ گران هێرشکری

سەرچەپەرێ خوەبێ بیست وپێنج چەقاڤێد
نوی تێزکری
ئەز ئێخسیرا بابێ جەمیلم
گوینا سیارێ حەمدانیێ
ئەز بەتنێ
لێ دابێ – لێ دابێ
ژدلێ مرا خوبانا خوش نهالێ
وێ لمن خوش تێ ،
دەنگێ چوبە چوبێ وهەوارو
گالە گالێ
ئەز ناکەڤم حەیفا کوژتنا مێرا . .
حەیفا منا دکەڤی سەروێ حەیفێ
قومسورێد رومێ
تەرمێ بابێ جەمیل کری ئارمانجا
بێ خوەییا ڤێ قەوالێ
ئەز ئێخسیرا بابێ جەمیلم
گوینا سیارێ حەمداینێ
ئەز بەتنێ

## ٧ – دوتمام

لێ لێ دوتمام . . دوتمام
هەکە ژبەر تە نەبیت
تژی گوندێمە زەرینە
پاخلێد ڤان زەرییا شەماموکێد ناڤارەزا ،
سۆر و سپینە
هەچی خورتێ ڤێ زەمانی یارەکا بدلێ خو
دگوندیدا نەبیت
حەیا ساخن چاڤ لدەرن ، بێ هیڤینە
لێ لێ دوتمام . . دوتمام
هەکە ژبەر تە نەبیت
تژی گوندێ مە ئەسمەرن
پاخلێد ڤان ئەسمەرا شەماموکێد ناڤا رەزا ،

[redacted]

سۆز و زەرن
هەمچی خورتێ ڤی زەمانی یارەکا بدلێ خو
دگوندی‌دا نەبیت
حەیا ساخن ، دپێ هیڤینە ، چاڤ لدەرن . .
ێ لێ دوتمام . . دوتمام
گەلێ دودێ دو دەرینە
قرکا بەژنا بلند
ژ حلان ومەرجانان . .
خالی نینە
جابەکا خێرێ ژزوزانا ژمرا هاتی‌یە
ئەڤرو بەژنا بلند
خەمل وکوکێد خو دانینە
لێ لێ دوتمام . . دوتمام
گەلێ دودێ بکەرەنگە
قرکا بەژنا بلند
ژحلان ومەرجانان . .
چەندا تەنگە
جابەکا خێرێ ژزوزانا ژمرا هاتی‌یە
ئەڤرو بەژنا بلند
نەمای رەنگە

فەروز ودەهمەن :

(١) شەکر ئاغایێ کورێ عەمەر ئاغایێ گرافی پشتی‌مشەخت بوی ل‌گوندێ (ئاسیهێ) ئاکنجی ببو . . دەما زڤری‌یە زوزانا پشتێ جەنگێ بدەستێد میرەکێد (چەلێ) هاتە کوژتن ، حەتا مویسایێ هاجا پاشی تولا وی ڤەکر ، گەلەك ستران بکوژتنا وی هاتینە گۆتن وەکی :

های شەنگە شەنگە ، شەکر ئاغا شەنگە
سەر مل گرانە ،
ل ملا حەڤت رەنگە
کەربو بابو ، دیوانا تەنگە
لسەرێ دیوانێ ژدیوانێ پێدا
چەمیا سلاڤێ ،
میر خەنجەر لێدا
حەیفا شەکر ئاغای کەڤتی‌یە دتەنگێدا

(ززاردەڤێ هێژا مەلا قاسمێ سماهیل مەهمەدا روژا ئەینی ١٩٨٣/١٠/٧ز)

(٢) تەپیرگوری : ناڤێ وێ (پیرگولێ‌یە) دکەڤیتە نێزیکی جولەمێرگێ بهژرا من ژیمر قاڤێ وەلی هاتی‌یە .

(٣) ئێك سوێرو : ئێك سیارو –کوحوسێنێ حەرۆ بتنێ بو ژیمر قاڤێ وەلێ هاتی‌یە .

(٤) کێڤرا : کەڤرا ، تە حێد بەری .

(٥) پاپتون : عەرەبانەنە هەسپ دکێشن ، بکوردی دبێژنێ : تەگلەتوی . ژزاردەڤێ مەلا قاسمێ سماهیلێ مە همەدا روژا ئەینی ١٩٨٣/١٠/٧ز .

(٦) هێژا نوردیخانێ جەلیل دپەرتوکا خودا (سترانێ زارگوتنا کوردا یەتاریڤیێ – ب : ٣٤١) سترانەك بناڤێ طاهرخان تومارکری‌یە ، پێدڤی‌یە بێژین ئەڤ دەڤە باشقەیە . ع . م .

(٧) قلێنی : بازێرەکێ شکاکایە لدەوروپشتێد وانێ .

(٨) مەلازکەند : نەدویرە هەر (مەلازکورد) بیت کو دکەڤیتە ژوری‌یا دەریا وانێ .

(٩) تونجەلی : دکەڤیتە روژهەلاتێ تۆقات وسێواس لژێری‌یا ئەرزنجاندا . دیارە کورد دبێژنێ رەش‌تونجەلی .

(١٠) من نەزانی بازێرێ (تەشیربازێ) دکەڤیتە کیڤە ؟ ! .

(١١) حەمدانی : رەنگەکێ ماهینایە .

(١٢) عەینەلی : رەنگەکێ تڤەنگایە .

# (گەشانەوەی ژیلەمۆی ژێر خۆلەمێشی کوانووی کۆنی کوردەواری‌مان)- «گۆرانیی و گۆیندەی کورد» (ئەحمەدی سەعید) (١٩٠٠ - ١٩٣٨)



عثمان شارباژێری

- خوالیٚ‌ی خۆش بیٚ ، مامۆستا نجم‌الدین مەلا (١٨٩٨-١٩٦٢) هەر بە تەنیا خەمخۆری ئەدەبی کوردی نەبوو ، بەلْکوو زۆر بە تەنگ هونەر و رۆشنبیریی و کەلەپوورو فۆلْکلۆری کوردی‌یەوە بوو .

- دەربارەی هونەر برێکی باش خزمەتی گۆرانیی کوردیی کردووە چ بە لێکۆلْینەوە لە هەندیٚ گۆرانیی کوردی‌و چ بە نوسین سەبارەت بە ژیان‌و بەرهەمی گۆیندەکانی کورد .

- ئەوەی من بیزانم ئەم ووتارەی مامۆستا نجم‌الدین مەلا (لە گۆیندەکانمان ئەحمەدی سەعید) لە رۆژنامەی (ژین) ژمارە (١٦٧١) رۆژی ١٩٦٢/٤/٥ دوایین نوسینە لە ژیانی مامۆستادا لە (ژین)دا بلاْوی‌کردووەتەوە[١] .

- بیست‌و یەك سالٚ بە رۆژو حەفتەو مانگ‌و سالْەوە تیٚ‌پەری حەزم ئەکرد شتێك دەربارەی ئەم گۆیندەیەی کورد بزانم تاکوو بە رێکەوت لە بەهاری سالْی (١٩٨٣)دا رۆژێك چوومە (ستۆدیۆ گۆیژە) لە سلێمانی وێنەی ئەم کابرا کوردەم دی بە کەواو

سەڵتەوە . لە ژێریدا نووسرابوو (ئەحمەدی سەعید) .
بیرەکەوتەوە گۆرانیبێژێکمان هەیە بەم ناوەوە . لە خاوەنی (ستۆدیۆ) کەم پرسی کە ناوی (بابا عەلی)یە !
- ئەم وێنەیە - ئەحمەدی سەعید -ی گۆیندە نی یە ؟
(باباعەلی) ووتی نایزانم . ووتم کێ وێنەکەی هێناوە . لە بەری بگریتەوە بۆی . لیّ‌ی بپرسە .
- پاش ماوەیەك چوومەوە بۆ لای (بابا علی) ووتی بەڵێ وێنەی (ئەحمەدی سەعید)ی گۆیندەیە ئەوەیە کە تۆ دەتویست . ناو نیشانی خزمێکی بۆ هەڵدام[٢] . چووم بۆ لای‌و دەربارەی ئەو بەهرەمەندە ووتی :

ناوی تەواوی ئەو گۆیندە دەنگخۆشە (ئەحمەد کوڕی سەعید کوڕی ئەحمەدقیتە)یە .

ساڵی (١٩٠٠) لە شاری سلێمانی لە گەڕەکی (پیرمە سوور) لە دایك بووە .

- قوتابخانەی (اعدادیە)ی ئەو سەردەمەی تەواوکردووە . بووە بە (کاتبی گومرگ) لە پاشا (کاتبی مدنی) لای مدیری پۆلیس ! دواجار . کراوە بە (رئیس عرفا)ی پۆلیس‌و نێرراوە بۆ (پێنجوین)
- لەبەر دەنگخۆشی‌و مەقام زانینی زور ڕێزی گیراوە لە سەر داخازی (وەکیل موتەسەریفی سلێمانی (ناجی هورمزی)[٣] داوەتی بۆ بولبولی کوردستان (سەید عەلی ئەسغەر) کردووە . لە (بلکیان) دوو شەو (گۆوەندو گۆرانی‌یان) سازکردووە . لەو داوەتەدا (حسەین خانی تارزەن) و ( سەید ئەشرەفی) کوری سەید عەلی ئەسغەر . بەشداربوون . (ئەحمەدی سەعید) خۆی مەسرەفی ئەو ئاهەنگ‌و گۆوەندەی کێشاوە .
- لە (کۆمپانی‌یەکانی قەوان) لە بەغداوە داوای لیّ‌کراوە کە گۆرانی‌یەکانی بۆ تۆمار بکەن لەبەر کەمتەرخەمی‌و کاروباری خوی نەچووە بە دەنگیانەوە . شوێنەوار و بەرهەمی دەنگی لە دوا بە جیّ‌نەماوە . ! .
- لە پێنجوین تووشی (نەخۆشی جگەر) بووە و هەر بەو نەخۆشی‌یە کۆچی دوایی‌کردووە لە ساڵی (١٩٣٨)دا . گۆڕەکەی لە (گردی سەیوان)ە .
- دوو کوری لە دوا بە جیّ ماوە کاك (صلاح‌الدین)و کاك (کمال) کە ئێستا لە سلێمانی نیشتەجێن . لەگەڵ کچێکدا .

## لە گۆرانی‌یەکانی ئەحمەدی سەعید
## (دولبەر)

### (بەستە)

**نەغمەی سێگا:**
**هۆنراوە :کۆن:**
**گۆرانی ی :ئەحمەدی سەعید:**

ئەوا گەییشتە جیّ . قەتاری سنە
یەکێکیان تیایە نازداری منە

+ +

سەرقافڵەچی گیان . بگرە لەنگەرێ
لەگەڵ تۆدایە . ناسکە دولبەرێ

+ +

پڵپڵەی ئاڵتوون شۆڕبوونە خوازێ
ڕاگیربوون لە سەر جووتە هەنارێ

+ +

هەر خۆم بە سەر گەرد نازو نیگاکەت
گیانم بە فیدای تۆزی ڕێگاکەت

+ +

مودەتێکە من چاوم لەرێ‌یە
دڵم زامارە یار شیفای پیّ‌یە

+ +



## (٤)

## مەقام سێگا

گۆرانی : ئەحمەدی سەعید
هۆنراوە : (کوردی)[٥]

«تەبیب دێنن ، دەوای دەردم بکا ، خۆ من زەدەی دووریم
«بەبێ (دارووی) وەسڵی ئەو نی‌یە ئارامو تەسکینم .
«ئەگەر مومکین نەبوو ژینم ، کە من مردم وەسیەت بێ
«لە باتی قەومو خوێشانم ، لە سەر مەیتم بکاشینم»
«شەهیدی عەشقمو مەمشۆنو کفنم بۆ مەکەن یاران
گەواهی حەشرە بۆ دەعوای شەهادەت بەرگی خوێنینم
«لە پەردەی تاهیری[٦] گەر بێ سەدای ئەو عاشقی یارەم
ئیتر حاجەت نی‌یە بێنن مەلا بۆوەعزو تەلقینم
«عەبەس کوردی مەلائك‌دێن دەپرسن مەزهەبو دینت .
کە قادر خۆی دەزانێ من لە سەر کام مەزهەبو دینم .

(پەراوێز)

١ ماموستا یوسیوێتی (١٩٠٠) بووە (١٩٣٥) مردووە . کەس‌و حزمانی دەڵێن (١٩٣٨) کۆچی دوایی کردووە .

٢ - ئەو حزمەی (ئەحمەدی سەعید) ناوی کاك (حەمە علی کوێخا صالح)ە لە سلێمانی بەرگدرووە دوکانەکەی لە خوار (خەستەخانەی ناوەڕاست) .

٣ ناجی هورمزی ، وەکیلی متصرفی سلێمانی بووە لە ڕۆژی ١٩٣٦/٧/٢٥ تاکوو ١٩٣٧/٩/٣٠

٤ ئەم هۆنراوە فۆلکلۆری‌یە بە (بەستە)وە ووتوێتی هۆنراوەکەی (مستەفا بەگی کوردی) بە (مەقامی سێگا)وە (مامە حەمەی نانەوا) ،هاوڕێ‌و هاوگۆی ئەحمەدی سەعید) بووە ئەو شیعرەکانی دەزانی‌و لە دەمی ئەوەوە وەرم‌گرتووە .

٥ - بڕوانە ل ٢٧ (دیوانی کوردی) . ماموستا گیو موکریانی .

٦ - تاهیری : لقە مەقامێکە لە مەقامەکانی عێراق پێ‌ی دەگوترێ (زەنگەنە) . سەرهەڵدانی ئەم مەقامە ئەگەڕێتەوە بۆ عەشیرەتی زەنگەنەو لە ڕیشەدا مەقامێکی کوردی‌یە . بەڵام ماموستا گیوی خوالێ‌خۆش‌بوو کردوویەتی بە پەردەی (ظاهری) .

# جیهانی بازرگان

نووسینی
محمود مەراغی

مرۆی سەرەتای چەرخی مرۆڤایەتی چی پێویست بوایە ، خۆی ئەیهێنایە بەرهەم . هەر خۆی خۆراکو پۆشاکو نشینگەو هۆی هاتوچۆی خۆی لە سروشتی دەوروبەری بۆ خۆی ساز ئەکرد .

بەلام لەگەلٚ بەرەو پێش چوونی مرۆڤایەتیو پەیدابوونی «پسپۆری»و داهێنانی گەلێ جۆری جیاجیای بەروبوو ئالٚوگۆڕ بوو بە شتێکی پێویستو بازرگانی بوو بە پیشەو ، لە قۆناغێکی لەپێشتریشدا پارە جێی ئالٚوگۆڕی گرتەوەو بوو بە دیاریکەری بالی (قیمەت) .

ئەمە بەدرێژایی سالەهای سالٚو لە ماوەی ڕەوتێکی دوورو درێژی مرۆڤایەتیدا ڕوویداوە کە بەدرێژایی ئەم ڕەوتە بازرگانی واتای خۆی لەکیس نەداوەو ، هەر هۆی پڕکردنەوەی کەلێنی هەر پێویستییەك یا نیشانەی لە پێویست زیاتری بەروبووی کەسێك بووە ، یا لە یەك کاتدا بەجارێ هەردوو واتاکەی هەیەو زۆرتریش وایە .

ئەمە بەش بەحالی ئەمو ئەوو ئەم کۆمەلٚو ئەو کۆمەلٚو ئەم دەولەتو ئەو دەولەت ڕاستەو ، ئالٚوگۆڕ لە دوا لێکدانەوەدا هەلوێستی هێنانەبەرهەمیشو بەکارهێنانیش ئەخاتەروو . مامەلە لەگەلٚ کەسێکی تر ، مامەلە لەگەلٚ خۆیەکی لەپێشەوەیە کە هەلوێستی ئابووری ئەم دەولەتو ئەو دەولەتو ئەم تاقمو ئەو تاقم دیاری ئەکا .

کە سەیرێکی ژمارەکانی بازرگانیی جیهانیش ئەکەین ، ئەمەمان بە وەرگێڕراوە سەر ژمارەی بەوردی ئەخاتە بەرچاو .

لە سالی ١٩٨١دا ولاتانی جیهان ، بەپێی ئەژمارەی «جات» بایی ١٩٧٠ ملیار دۆلاریان ناردووەتە دەرەوە . بەشی ولاتە سنعاتدارەکان [مەبەست لە ولاتە سەرمایەدارە پێشکەوتووەکانە] لەم ١٩٧٠ ملیار دۆلارە ، ١٢١٥ ملیار دۆلار بووە . ئەویکەشی بەشی جیهانی سێهەمو ولاتانی بەرەی ڕۆژهەلات [مەبەست لە ولاتە سۆشیالیستەکانە بووە .

لە مەیدانی لە دەرەوە هێنانیشدا هەمان شت : ولاتانی جیهان لەو سالەدا بایی ٢٠٣٠ ملیار دۆلاریان لە دەرەوە هێناوە بایی ١٣١٥ ملیار دۆلاری تەنها ولاتە سنعاتدارەکان هێناویانە .

ئەمە هەمووی یانیٚ چی ؟ ئەمە یانیٚ ئەوە کە ٧ر٦١٪ی کەلوپەلی بۆ دەرەوە نێرراوو ٨ر٦٤٪ی کەلوپەلی لە دەرەوە هێنراو بەتەنها بۆ ولاتە سنعاتدارەکان بووە کە تەنها ٦ر١٥٪ی دانیشتووانی هەموو جیهانیان تیایە ، یاخود : کەمتر لە ٢٠٪ی دانیشتووانی هەموو جیهان نزیکەی دووسێیەکی بازرگانیی جیهانیان بردووە بۆ خۆیان .

هەر بەوپێیەیش کە بازرگانی نیشانەی هێنانە بەرهەمە ، ئەتوانین بلێین بەشی هەرە زۆری بەروبوو هی ئەم بەشە کەمەی جیهانو ، بەشە کەمەکەیشی هی بەشە زۆرەکەیەتی .

بۆئەوەیش کە ئەم قسەیەمان بسەلمێنێ ، ئەلێن ٨ر٧٦٪ی دانیشتووانی جیهان کە بەپێی ئەژماری بانقی جیهان لە سالی ١٩٧٩دا گەیشتوونەتە ٣٢٧٠ ملیۆن کەس ، خەلکی جیهانی سێهەمنو ، لە سالی ١٩٨١دا تەنها چواریەکی بازرگانیی جیهان هی ئەم نزیکەی سێ چواریەکەی دانیشتووانی جیهان بووە .

کەواتە تایەکانی تەرازووی جیهان زۆر لاسەنگن لاسەنگییەکەیش ئەوەیە کە بەروبووی تاکەکەس لە جیهانی سنعاتداردا ، لە بە روبووی تاکەکەس لە جیهانی گەشەکردوودا زۆرترە . شتیوا لەوانەیە ئەم بەراوردە بە نارێك دەرکا بۆنموونە ئەوەتە جیهانی پێشکەوتوو خۆی مەرجو نرخ

دائەسەپێنێ و جیهانی تازە گەشەکردوویش هەر ئەوەی بۆ ئەمێنێتەوە مل کەچ کاو پارە بداو شوێن بکەوێ . . یاخود کەل‌وپەلی پیشەسازی هەمیشە نرخی زیاد ئەکاو کەرەستەی خاویش زیاتر وایە نرخی کەمەو ، نرخی کارەکەیش جیاوازی نێوان ئەو دوو نرخەیەو ، هەوڵی ئادەمیزاد کەرەستەی خاو ئەکا بە کەل‌وپەلی پیشەسازی . . بەڵام خۆ لێرەیشدا ئەبینین نرخی کار لە ولاتانی سنعاتدارو تازە گەشەکردوودا زۆر لە یەك جیان . . ئەگەر تەکنۆلۆژیی نوێ و زۆریی کەرەستە جیهانی پێشکەوتووی هەڵاوێردبێ ، سیستێمی ئابووریی جیهان و دەسەڵاتی بەهێزانو زۆری ڕژێمی سەرمایەداریش کارێکیان کردووە نرخی یەکەی کار لە ئاکوور جیابێ لەو نرخی یەکەی کارە کە خەڵکی باشوور . زۆر جار لە یەك کارو بەرابەر بە یەك بەرهەمدا ، وەری ئەگرن .

ئەمە شێوە گشتی‌یەکەیە کە ژمارەی سادەو کورتی جیهانی بازرگانی پیشانی ئەدا . بەڵام کە درێژە بە مەسەلەکە بدەین شتی تازەترمان بۆ دەرئەکەوێ .

بەپێی ئەژمارەکانی «جات» ناجۆریی کەل‌ووپەل ناردنە دەرەوەو کەل‌وپەل لەدەرەوە هێنان . هەموو جیهانی گرتووەتەوە بەرەی ڕۆژەڵات نەبێ . هەر ئەو بەرەیەیە . وەختە بڵێن ، کەل‌وپەلی لە دەرەوە هێنراو بۆدەرەوە نێرراوی وەختە ئەوەندەی یەك بووبێ . چ لە ١٩٨١و چ لە ١٩٨٠و چ لە ساڵەکانی تردا .

لەوەش زیاتر ، وەختە بڵێن ژمارەی دانیشتووانی ولاتانی ئەم بەرەیەو بەشە بازرگانی‌یان لە بازرگانیی جیهاندا وەختە ئەوەندەی یەك بێ . بەپێی ئەژماری بانقی جیهانی دانیشتووانی ئەورووپای ڕۆژهەلات لە ساڵی ١٩٧٩دا ١٧ر٨٪ی دانیشتووانی جیهان و . هەر بەپێی ئەژمارەکانی بازرگانی بەشە بازرگانی‌یان ٩٪ی کەل‌وپەلی بۆدەرەوە نێرراوو ٧٦ر٨٪ی کەل‌وپەلی لەدەرەوە هێنراو بووە .

کەواتە جیهانی هاوسەنگ تەنها هەر ئەمە . . ئەوی‌کەی جیهانی ناهاوسەنگە . یا بە پێشکەوتن یا بە پاشکەوتن .

خۆ ئەگەر لەسەر لێکدانەوەی ئەم ناهاوسەنگی‌یە بڕوێن . دوو ڕاستی‌ترمان بۆ دەرئەکەوێ یەکەم : بەردوامین بوونی ڕێدەیەکی زۆری دەرامەتی ولاتانی نۆیەك کە لە ساڵی ١٩٨١دا بایی ٢٧٠ ملیار دۆلاریان ناردووەتە دەرەوەو بایی ١٥٥ ملیاریان هێناوە کە واتە بایی ١١٥ ملیاریان زیادە [دیارە ئەمە و ئەگەیەنێ هەر ئەبێ ئەوەندە پارەشیان زیاد بێ . چونکە لەم پارە نرخی جۆرە بازرگانی‌یەکی‌تریش ئەدەن کە بازرگانیی خزمەتکاری‌یەو هەروەها گەلێ باری نێو دەوڵەتانیشیان لەئەستۆدایە بەتایبەتی پارمە تیی ئابووری] .

دووهەم : ئەوەتە بێدەسەلاتیی دەوڵەتە تازە گەشەکردووەکانی‌تر ، کە لە ساڵی ڕابووردوودا گەیشتووەتە ٦٥ ملیار دۆلار ، هەر بەردەوامەو ئەمەیش ساڵبەساڵ قەرزارتریان ئەکا .

ڕۆژاوا لای‌وایەو ڕێکخراوە نێو دەوڵەتەیەکانیش لەسەر ئەمە ئەڕۆن کەوا چاری ئەم ناهاوسەنگی‌یەی بازرگانی هەر بەوە ئەکرێ کە بازرگانی ئازاد بێ ، چونکە هەرچەند کەل‌وپەل زۆرتر بێ . مەڵبەندەکانی هێنانە بەرهەم چالاکانەتر کارئەکەن و ڕادەی گەشەکردن زیاتر ئەبێ .

بەڵام . . .

بە تاقی‌کردنەوە دەرکەوتووە ڕۆژاوا هەموو کۆسپەکانی ڕێگای ئازادیی بازرگانیی لانەبردووەو هەموو بازرگانیی ئازاد نەکردووە .

هەروا بە تاقی‌کردنەوە دەرکەوتووە جیهانی تازە گەشەکردوویش نەیتوانیوە لە ڕێگای دەلاقەی بازرگانی بە ڕووی دەرەوەدا کردنەوەوە ڕادەی گەشەکردنی خۆی بەرەپێ‌بدا . بەپێچەوانەوە گەشەکردنی کەمتری کردووەو ، لە ڕێگای تاقیکردنەوەی ئازادیی بازرگانی‌یەوە دەرکەوتووە ئەبێ زیاتر پشت بە دەرەوە ببەستێ .

هەرچۆن بێ . لە ڕێگای داوای ئازادیی بازرگانی‌و هۆی‌ترەوە . جیهانی سنعاتدار ئەم پێشکەوتنەی دەسگیر بووە کە ئەژمارەکانی بازرگانی پێشانی ئەدەن . ئیستا ئەو گیروگرفتەی لە بەردەمی جیهانی سێهەمدایە ئەوەیە چی بکا تا بتوانێ ترازووەکەی هاوسەنگ بکاتەوە .

م . م . ك .
لە گۆڤاری (العربي)ی کووەیتیەوە
وەری‌گێڕاوە

# خشتەی وەختە جیۆلۆجی‌یەکان (جدول الازمنة الجیولوجیة)

**Geological time scale**

**گۆرینی**
**کەمال جەلال غەریب**

**ووشەی جیۆلۆجی** Geology لە پێشگری (Geo) واتا (زەوی)و پاشگری (logy –) واتا زانیاری . پێکهاتووە . کەوابوو ووشەی جیۆلۆجی (زانیاری زەوی) دەگرێتەوە . ئەو زانیاری‌یەی کە لە خرۆکی زەوی دەکۆلێتەوە بە خۆیو چینە هەمە جۆرەکانی‌یەو وئەو شتانەی کە تیایاندان وەکوو کەڤر (صخر Rock و پەترۆل Petroleumو ئاوی ژێرزەمین (میاه جوفیة underground water)و بوو بەردەکان (متحجرات Fossils) وئەو گۆرانانەی کە بە سەر خرۆکی زەویدا هاتوون لە کاتی دروست‌بوونی‌یەوە هەتا ئێستا . کە ئەمەش سوودێکی یەکجار زۆری لی‌وەردەگیرێت لە مەیانی ئابوری‌و سامان‌و کشتوکاڵ‌و دامەزراندنی پردو بەندو ساختمانەدا . . . هتد .

**خشتەی وەختە جیۆلۆجی‌یەکان :**

لەوەتی زانیاری جیۆلۆجی هاتۆتە کایەوە . بیروڕای زاناکان دەربارەی خرۆکی زەوی دەخولێنەوە . ئایا خرۆکی زەوی لە وەختی پەیدابوونی‌یەوە هەتا ئیمرۆ (بە تایبەتی لەم ملیۆن ساڵەی دواییدا) بە چەند قۆناغدا رۆیشتووە ؟ لەبەر ئەوە خوێندن‌و لێکۆڵینەوەی ووردی ئاراستەی ئەو کەڤرە نیشتەنی‌یانە (صخور رسوبیة Sedimentary rocks) کە لە دەریاو گۆمو رووبارەکاندا بە شێوەی چینی‌یەك لە سەر یەك نیشتوون بە جۆرێکی ئەوتۆ . کە چینەکانی سەرەوە (تازەترن وەك لە چینەکانی ژێرەوە ئەمەش پی‌ی دەووترێت (یاسای دوا بە دوا هاتنی چینەکان – قانون تتابع الطبقات Law of Superposition) . لەم یاسایەوە کلیلە نهێنی‌یەکەی دەروازەکانی سەردەمە جیۆلۆجی‌یەکۆنەکان بە دەست‌کەوتووە . کەڤرە نیشتەنی‌یەکان بووبەردی ئەوتۆیان تێدایە کە هەر چینێك لە چینەکانی سەردەمە جیۆلۆجی‌یەکان لە یەکتری جیادەکەنەوە . ئەم بووبەردانە یارمەتی زانینی تەمەنی رێژەیی ئەو چینە نیشتەنی‌یانە دەدەن . تەنانەت ئەگەرەکوو ئەو چینانەدا چوون یان هەڵگەرانەوە یان نوشتانەوەشیان بە سەردا هاتبێت .

زاناکان لە ئەنجامی خوێندنی ئەو کەڤرە نیشتەنی‌یانەی کە ئاوو هەواو داخوران (تاکل) زۆر کاریان تێ ناکاتو جۆری ئەو بووبەردی گیاندارو رووەکانەی کە تیایاندان وەختی جیۆلۆجی‌یان کردووە بەم بەشانەوە :

لە پێشدا بە دوو هەرە دێرینەوە (ابد EON) کە هەر یەکێکیان دەکرێت بە چەند دێرینێکەوە (دهر Era) وهەر دێرینێکیش دەکرێت بە چەند چاخێکەوە (حقبة Period) وهەر چاخێکیشی دەکرێت بە چەند سەردەمێکەوە (عصر Epoch) وهەر سەردەمێکیشی بە چەند سەدەیەکەوە (عهد Age) و هەر سەدەیەکیش بە چەند بارێکەوە (طور Phase) کەوابوو بە کورتی مێژووی جیۆلۆجی زەوی کراوە بەخشتەیەکی ئەوتۆوە کە جۆری ژیانی (گیاندارو رووەك) وباری رووی‌زەوی‌و ئاوو هەوای ئەو وەختانەی تیادا بەدەرخراوە . واتا هەر چینێك لە چینەکانی زەوی (بە کەڤرو بوو بەردەکانی‌یەوە) بریتیە لە لاپەرەیەك لە لاپەرەکانی مێژووی زەوی باروو\شوێنەوارو چۆنێتی دابەش‌بوونی ئەو گیاندارو رووەکانەی کە لەو وەختانەدا لە سەر زەوی هەبوون تیادا تۆمارکراوە . کەوا بوو خشتەی وەختە

جیۆلۆجی‌یەكان بریتیە لە سالنامەیەك (لیستەیەك) بۆ رووداوە گرنگەكانی مێژووی زەوی‌و پشت بە زانیاری چینەكانی زەوی (Stratigraphy) دەبەستێت كە بریتیە لە خوێندنی كەفرەنیشتەنی‌یەكان لە بارەی مێژوو بنەرەتیانەوە . ئەم كەفرانە بە درێژایی وەختە جیۆلۆجی‌یەكان لە دەریا كۆنەكانو شوێنەوارە ووشكانی‌یەكاندا نیشتوون . ئەمانە بووبەردیان تێدایە ، واتا پاشماوەی ئەو زیندەوەرانەی كە رۆژێك لە رۆژان لە سەر خرۆكی زەوی ژیاون . چونكە زیندەوەر بەردەوام بە كاری گەشەكردن (تطور (Evolution) وبە درێژایی وەختی جیۆلۆجی دەگۆرێن هەر بەشێك لە بەشەكانی ستونی جیۆلۆجی (عمود جیولوجی (Geologic (Column) واتا ئەگەر ستونێك لە چینەكان زەوی وەربگیرێت لە سەرەوە بۆ خوارەوە ، زیندەوەری تایبەتی خۆی تێدایە . لەبەر ئەوە ئەو بوو بەردانەی كەوان لە ناو كەفرە نیشتەنی‌یەكاندا مانا گرنگەكانی ئەو كەفرانە دەردەخەنو بریاری چۆنێتی خشتەی وەختە جیۆلۆجی‌یەكان دەدەن . لە سالآنی ١٩٥٠ كانەوە ئەنجامی ئەو زانیاری‌یانەی كە لە رێگەی پێوانی ووزەی تیشكی‌یەوە (رادیومترية Radiometric) دەستگیر بوون . بە ووردی تەمەنی ئەو كەفرو بوو بەردانە زانروە دوو رێگەی جیاواز هەیە بۆ تۆماركردنی كاروبارە جیۆلۆجی‌یەكان :-

١ - یەكەی زانیاری چینەكانی كەفر Rock Stratigraphic unit

٢ - یەكەی زانیاری چینەكانی وەخت Time stratigraphicunit

یەكەی‌زانیاری چینی كەفر ، بە تایبەتی ، باسی جۆرەكانی ئەو كەفرانە دەكات كە لە پێكهاتنی زەویدا بەشدارن پێكهاتەكانی (تكوينات Formation) هەریەكێكی تایبەتی لە خۆیاندا بە پێ‌ی وەخت ریزبوون (كەفرە تازەكان لە سەرەوەو كۆنەكان لەژێرەوە) .كەچی بە پێچەوانەوە ، یەكەی زانیاری چینی وەخت ئەو كەفرانە دەگرێتەوە كە لە بەشێكی تایبەتی وەختی جیۆلۆجیدا دروست‌بوون . سا هەر چۆنێك بێت شێوازی كەفرەكە . دەبێت ئەوەش بزانین كە زانینی پەیوەندی لە نێوان چینەكانی زەویدا بە پێ‌ی تەمەنەكانیان رێگەیەكی گرنگە بۆ دۆزینەوەی مێژووی جیۆلۆجی هەریمێك یان ناوچەیەك . یەكەكانی وەختی جیۆلۆجی بریتین لە كورتەی‌یەكەكانی زانیاری چینی وەخت‌و هەمان ناویان لێ‌نراوە . بۆ نموونە رژێمی System كامبری Cambrian بەوە دەناسرێت كە بە شێوەی ریزە كەفری نیشتەنی یەك لە دوای یەك دەبینرێت بە تایبەتی لە ناوچەی (وێلز Wales) . دەشێت كە چاخێك بێت بە بنچینەیەكی سەرەكی بۆ زاراوەی (مصطلح Term) وەخت ، وەكوو چاخی كامبری Cambrian Period كە بە زۆری لە هەموو شوێنێكدا هەیە . پەیوەندی نێوانی یەكەكانی زانیاری چینی وەخت ویەكەكانی وەختی جیۆلۆجی لەم دیراوەدا روون كراوە تەوە :

| یەكەكانی وەختی جیۆلۆجی | یەكەكانی زانیاری چینی وە |
|---|---|
| Geologic time units | ic – stratigraphic units |
| دێرین (دهر E Era | ئیرائیم – Erathem) |
| چاخ (حقبة – Period) | رژێم (نظام – System) |
| سەردەم (عصر – Epoch) | زنجیرە (سلسلة Series) |
| سەدە (عهد – Age) | قۆناغ (مرحلة – Stage) |
| بار (طور – Phase) | پشتێنە (نطاق – Zone) |

یەكە بنچینەیی‌یەكانی وەختی جیۆلۆجی واتا (چاخەكان) خراونەتە كۆمەڵەی گەورەترەوە كە پێ‌یان دەووترێت (دێرینەكان) ، لەو ناوانەوە كە لە لایەن زانایان (ئادم سید گویك) كە سالی ١٨٣٨و (جۆن فیلیپس)ەوە لە سالی ١٨٤١ دا پێشنیاركراون ، وەكوو دێرینی پالیۆزۆیك Paleozoicو میزۆزۆیك Mezozoicو سینۆزۆیك Cenozoic ئەم ناوانەش . یەك لە دوای یەك ، مانای : ژیانی كۆن (الحياة القديمة ancient life) وژیانی ناوەراست (الحياة الوسطى middle life) و ژیانی نوێ (الحياة الحديثة Modren life) وەرگیراون . ئەم ناوانە ئەو گۆنانەی قوولآنە دەردەخەن كە بە سەر زیندەوەرەكانی ئەو وەختانەدا تێپەربوون لە سەرەتای دەست‌پێ‌كردنی هەر یەكێك لە ودێرینانەدا (لە خشتەیەكی تایبەتیدا بەشەكانی وەختە جیۆلۆجی‌یەكان پیشان دەدەین) . ئەو كەفرە گۆنانەی كە دەكەونە ژێر چینی پالیۆزۆیكەوە پێ‌یان دەوترێت بەر لە كامبری (ماقبل الكمبري Precambrian) وبووبەردی ئاشكرایان تیادا نیە . لەبەر ئەوە ئەم دێرینە ناتوانرێت لق لێ‌بكرێتەوە بۆ چاخ‌و سەردەم . . . هتد . دەشێت كە كەفرە تازەكانی پالیۆزۆك ومیزۆزۆیك‌و سینۆزۆیك پێكەوە لە ژێر زاراوەیەكژێر زاراوەیەكی فراوانتردا دابنرێن كە بریتیە لە زاراوەی ژیانی ئاشكرا (دیار ) (الحياة الظاهرة phanero zoic) . ئەو هەوڵ‌و تەقەللا بەرەتایی‌یانەی كە دراون بۆ دارشتنی خشتەی وەختە جیۆلۆجی‌یەكان لەبەر رۆشنایی چینەكانی كەفرە نیشتەنی‌یەكاندا لە

ـ‌ـ‌ی سەدەی (١٨) هەمدا بووە . زاناکانی چینەکانی زەوی
. ـ حیۆلۆجیستەکان گەلێك روونکردنەوەی تریان خستۆتە سەر
ـ سەدەی (١٩) هەمدا . هەتا دەیەکانی (عشرات Decades)
ـ ـ‌ی سەدەی بیستەم ، ئەوەبوو کە رێگەی (رادیۆمەتری)
ـ ـ . ئەم رێگەیە بوو دەریخست کەوا کەڤرە بووبەرد
ـ ـکانی ژیانی دیار کەوا ئەم هەموو خوێندنو لێکۆڵینەوەیەیان
ـ سەردەکرا تەنها بەشێکی یەکجار کەم لە وەختی جیۆلۆجی
ـ‌دەهێنن . ئێستاکە وازانراوە کە وەختی (بەر لە
ـمبری)ی یەکەم لە ٨٥٪ی مێژووی زەوی دەنوێنێت . هەر ئەم
ـکەیەش بوو کە بووە هۆی گەشە پێکردنی مێژوویی ساڵنامەو
حشتەی وەختە جیۆلۆجی یەکان .

خشتەی وەختە جیۆلۆجی یەکان لە کۆنەوە بۆ ئێستا :—

١ – هەرە دێرینی ژیانی نادیار : (ابد الحياة الخفية (Cryptozoic Eon) هەر وەها پێشی دەووترێت دێرینی بەر لە
کامبری (دهر ماقبل الكامبري Precambrian)، ئەم هەرە دێرینە
ـ زۆری کەڤری ئاگرینو گۆڕراوی تیادایە بەڵام پاشماوەی
زیندەوەری تیادا نیە ودەکرێت بە دوو دێرینەوە :

دێرینی ژیانی یەکجار کۆن واتا (دێرینی بێ ژیان) . (دهر الحياة السحيقة = دهر اللاحياة Archeozoic era = Azoicera)
کە (٥٠٠٠) ملیۆن ساڵ لەمەو بەر دەستی پێکردووەو نزیکەی
(٣٠٠٠) ملیون ساڵی خایاندووە . لێرەدا زەوی هێشتا کۆرپەلە
بووەو سەرەتای پەیدابوونی دەریاکانو ئاوو هەواو زیندەوەری
ساکاری تاك خانەیی دیوە .

ب دێرینی ژیانی سەرەتایی (دهر الحياة الابتدائية (Proterozoic era) کە (٢٠٠٠) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر دەستی
پێکردووە . لەم وەختەدا زیندەوەرە ساکارەکان گەشەیان
کردووەو بوون بە گیانداری تاك خانەییو قەوزەو کەروو . .هتد

٢ – هەرە دێرینی ژیانی دیار :

(ابد الحياة الظاهرة phanerozoic EON) کە بەر لە (٧٥٠)
ملیون ساڵەوە دەستی پێکردووەو ئەو کەڤرە نیشتەنی یانە
دەگرێتەوە کە بوو بەردو پاشماوەکانی تری زیندەوەریان تیادایە .
وەئەمە لە هەرە دێرینی پێشوو تازەترە . ئەمەش دەکرێت بە سێ
دێرینەوە :—

أ – دێرینی ژیانی کۆن (دهر الحياة القديمة Paleozoic era) =
ancient life کە دەکرێت بەم چاخانەوە Period =
حقبة) :—

١ – چاخی کامبری Cambrian – era
٢ – چاخی ئۆردۆڤیسی ordovician – era
٣ – چاخی سیلوری Silurian – era
٤ – چاخی دیڤۆنی – era
٥ – چاخی کاربۆنی (خەڵوزی) carboniferous era
٦ – چاخی پیرمی (Permi an–era)

ب – دێرینی ژیانی ناوەراست (دهر الحياة الوسطى (Mezozoic – era واتا middle life کە دەکرێت بەم
چاخانەوە :

١ – چاخی ترياس Triassic – era
٢ – چاخی جوراسی Jurassic – era
٣ – چاخی دەباشیری (تەباشیری) Cretaceous – era

جـ – دێرینی ژیانی نوێ Cenozoic – era کەماناکەی
Modren life دەگرێتەوە ودەکرێت بەم چاخانەوە :—

١ – چاخی سێهەم (ثالث) Tertiar : ئەمەش دەکرێت بەم
سەردەمانەوە (عصر Epoch) :

ا – پالیۆسین Paleocene واتا (بەسر تازە) ماناکەی old
recent) واتا (حديث باكر أو قديم) .

ب – ئیوسین Eocene واتا (بەرەبەیانی تازە) ماناکەی dawn
recent) واتا ( فجر الحديث) .

ج – ئۆلیگلۆسین Oligocene واتا (کەم تازە) (حديث قليل)
. little recent

د – مایۆسین Miocene واتا (ناوەراستی تازە = تازەی
ناوەراست Middle recent (حديث متوسط)

ە – پلیۆسین Pliocene واتا (زۆرتازە) Muchrecent (حديث
كثير)

٢ چاخی چوارهەم (رابع) Quater nary ئەمەش دەکرێت
بەم سەردەمانەوە :

ا بلیستۆسین Pleistocene واتا (زۆرتر تازە) (حديث اكثر
. More recent

ب هۆلۆسین Holocene واتا (تەواو تازە) (حديث تام)
. Complete recent

ئێستا لێرەدا کەمێك بە درێژی باسی چاخەکان دەکەین :

چاخی کامبری Cambrian Period

ئەم چاخە بەر لە (٦٠٠) ملیۆن ساڵەوە دەستی پێکردووە .
لێرەدا ژیان بوژاوەتەوەو قەوزەو هەندێك گیانداری پێشکەوتووی

وەکوو گیاندارە سی پلەکان (ثلاثیة الفص Trilobite وپێ بازوویی‌یەکان (عقدیات الارجل Brachiopods وئیسفەنجی‌یەکان Sponges وبۆش ریخۆڵەیی‌یەکان Coelênterate (امعائیة الجوف = لاحشویات) وەکوو ماسی‌یە وڵوڵەو کرمەکان Wormsو نەرمۆڵەکان Mollusca (وەکوو تاقلە چنۆکە) وپێست درکاویی‌یەکان Echinodermata دەرکەوتوون . بەڵام زۆرترین گیاندار لە بڵاوبوونەوەو ژمارەدا سی‌پلەکان بوون ، چونکە لەم وەختەدا لە هەموو دەریاکاندا بە بری‌یەکجار زۆر هەبوون بۆیە ناونراون بە (خانمی دەریاو زەریاکان) ، هەرچەندە لەدەریادا ژیان دەرکەوتووە ، بەڵام ژیانێکی پێشکەوتووو گەشەکردوو نەبووە ، بەڵام لە قۆناخەکانی داهاتوودا کۆمەڵە گیاندار زیاتر پێشکەوتوودەرکە وتووە . ناوی کامبری لە ناوی ناوچەی کامبری لە هەریمی (وێلز) لە ئینگلتەرە وەرگیراوە .

چاخی ئۆردۆڤیسی Ordovician Period

ئەمە لە ناوی جۆرە رەگەزێکی مرۆڤ‌کە لە ناوچەی وێلز لە ئینگلتەرە ژیاون ، وەرگیراوە ،ئەم چاخە لە (٥٠٠) ملیۆن ساڵ لەمەوبەرەوە دەستی‌پی‌کردوونەوە لەم وەختەدا گیانداری گەشە کردوو پەیدابووە ، بۆ نموونە ، بۆ یەکەم جار لە سەر خڕۆکی زەوی ماسی سەرەتایی (السمکة البدائیة Primitive Fish) و هەندێك گیانداری بڕبڕەدار پەیدابوون ، سەرەرای دەرکەوتنی هەندێك گیانداری دەریایی گرنگی وەکوو شیلان (مرجان Coral) وگیاندارە دەزوولەیی‌یەکان (حیوانات خیطیة Graptolites)و چەند جۆرێکی پێشکەوتوو لە پێست درکاویی‌یەکانو هەندێك گیانداری تاك خانەیی لەگەڵ چەند جۆرێکی تازە لە گیاندارە پێ‌بازوویی‌یەکانو پێ سەریی‌یەکان (راسیة القدم Cephalopoda) ، نموونەی ئەمەش وەکوو هەشت‌پێ (الخطبوط) ، دەرکەوتووە ، تەنانەت درێژی هەندێکیان گەیشتۆتە (١٥) پێ . لەم چاخەدا تەقینەوەی بورکانی لە هەندێك ناوچەکانی خڕۆکی زەویدا زور بووە وبنکی چەندەها لە دەریاکان بەرزبوونەتەوە بە هۆی جووڵەکانی خڕۆکی زەوی‌یەوە . گرنگترین کەڤری ئەم چاخە کە لە بنکی دەریاکاندا نیشتووە کەڤری تاوێر (طین صفحی Shale) وکەڤرە کلسی‌یەکان (صخور کلسیة ca/careous rocks) بووە . ئەم ناوە لە ساڵی ١٨٧٩دا لە لایەن زانا (چارلس لاپۆرث)ەوە نراوە بۆ ئەو ماوەیەی (ناوچەیەی کە کەوتۆتە نێوانی کامبری‌و سیلوری‌و ناکۆکی لە سەربووە ، هەروەها بۆ دەربرینی ئەو سێ قەدەی (نوشتاوی‌یەنی) ، کە لە مەیانی زانیاری بووبەردەوە ، لە سەرەتای چینی پالیۆزۆیکدا لە ئەوروپادا دەرکەوتووە . ئەوسنوورانەی‌کە (لاپۆرث) بۆ چاخی ئۆردۆڤیسی‌ی داناوە بە تەواوی لە سەر رۆشنایی زانیاری بوو بەردەکان بووە ، بە تایبەتی بوو بەردی (جرابتۆلایت) .

چاخی سلیوری Silurian period :-

ئەم چاخە بە ناوی رەگەزێك لە مرۆڤەکە لە ناوچەی وێلز لە ئینگلتەرەژیاون . بەر لە (٤٢٥) ملیۆن ساڵەوە دەستی پی‌کردووە نزیکەی (٢٠) ملیۆن ساڵی خایاندووە . جگە لە گیاندارەکانی چاخی پێشووکە لێرەشدا هەرماون‌و گەشەیان بە خۆیان‌داوە بۆ مەبەستی گونجان لەگەڵ شوێنەواری (بیئة) ئاویی‌و باری ژیانی تازەدا ، گیانداری تازەی تریش پەیدابووە . هەروەها کۆمەڵە رووەکی (Flora) تازەش ، کە لە پێشدا لە دەریاو زەریاکاندا پەیدابوون ، ئەمانە بوونە خۆراکێکی باش بۆ چەندەها گیانداری دەریایی‌و هەروەها پەناگەیەك بۆ گەرادانانی گیاندارەکانی‌تر . گرنگترین زیندەوەری ئەم چاخەش : قەوزە ، شیلان ، دوو قاقلەیی‌یەکان (ثنائیة القواقع) و پێست دەرکاویی‌کان (وەکوو ئەستێرەی دەریا = نجم البحر)و سی‌پلەکان‌و ماسی‌یەکان بووە . لەم چاخەشدا تەقینەوەی بورکانی هەر زۆر بووە بە تایبەتی لە ئەوروپادا ، جگە لەوەی کە بیابان لە گەلێك ناوچەدا زۆر بووە وچەندەها نیشتەنی خوی‌یی (رواسب ملحیة) دەرکەوتووە .

تێبینی (کامبری‌و سیلوری) :-

دوای ئەو لێکۆڵینەوە خەست‌و خۆڵەی کە لە زنجیرەی پالیۆزۆیکدا کراوە لە ناوچەی وێلز Wales ، دوو جیۆلۆجیستی بەریتانی (ئادەم سیدگویك‌و رۆدریك ئیمپی مۆرچیسۆن) یەك لە دوای یەك ناوی کامبری‌و سیلوری یان دانا بە ناوی هۆزە کۆنەکانی وێلیش لە ساڵی ١٨٣٥دا . مۆرچیسۆن زۆر بە ووردی ئەو بووبەردە زۆرانەی تۆمارکرد کە لە چینی سیلوریدا هەبوون ، بەڵام چینەکەی سید گویك واتا کامبری بووبەردی کەمتر بوو ، لەبەر ئەوەکارەکانی ئەمیان زۆرتر پەیوەندی‌یە خوێندنی کەڤرەوە هەبووە مۆرچیسۆن لە لوتکەی زنجیرەی ژێرەوەی پالیۆزۆیکەوە ، لە خۆرهەڵاتی باشوورەوە ، دەستی کرد بە ئیش ، بەڵام

ـــگویك له بنەوه دەستی پیْ‌كرد ، له خۆرئاوای باكوورەوه ، هەردووكیان بەرەو یەكتری دەچوون له ئیش‌كردنەكەیاندا ، له تەیـدا دەركەوت كه ئیشەكانیان به یەكتریدا دەچێت وخەریكه تێكەل دەبێت . ناكۆكی له نێوانیاندا پەیدابوو . بەڵام دوای (٤٤) ســـ- ئەو ناكۆكی‌یه چارەسەركرا بەوەی كه زانا (چارلسی لاپوێرث) ئەو ماوەیەی نێوانی هەردووكیانی ناونا چاخی ئۆردۆفیسی .

## چاخی دیڤۆنی Devoniam Period

ئەم چاخه له نزیكەی (٤٠٥) ملیۆن ساڵەوه دەستی‌پی‌كردووەو نزیكەی (٦٠) ملیۆنز ساڵی خایاندووه . لەم چاخەدا ، به تایبەتی له دەریاكاندا ، ماسی به ژمارەیەكی یەكجار زۆرو هەمه جۆره بڵاوبۆتەوه هۆی نەشونماكردنی ئەم ماسی‌یانەش گەراوەتەوه بۆ زۆری رووەكه دەریایی‌یەكان‌و بوونی بڕی زۆر له خۆراك . چونكه ئەم ماسی‌یانه به زۆری گیانداره سێ پلەكانیان خواردووه . بەڵام له سەرووشكانی (زەوی) بۆ یەكەم جار چەندەها رووەكی هەمه جۆره دەركەوتووه . هەروەها جۆره سەرەتایی‌یەكانی گیاندارەكانی ووشكانی‌و خشۆكه سەرەتایی‌یەكان Primitive reptiles دەركەوتووه . بۆ نموونه ، بۆ یەكەم جار ، له سەرو وشكانی ، ئەو گیاندارانه دەركەوتوون كه به شێوەی ماسیدا بوون لەگەڵ جۆری كەتەله جاڵجاڵۆكه جگەله مێرووی هەمەرەنگه ، هەروەها زنجیرەكه قری مەرجانی له قەراغ دەریاكاندا (شعاب مرجانية Coral Reefs) به شێوەیەكی ئاشكرا له چەندەها ناوچەی خرۆكی زەویدا پەیدابووه . بۆ یەكەم جار گیانداره تەزبیحی‌یەكان (سبحيات Ammonite) ، كه سەدەفێكی پێچاو پێچی هەیه ، دەركەوتووه . بەڵام ئەو گیانداره دەزووڵەیی‌یانەی كه له چاخەكانی پێشوودا ژیاون لێرەدا به تەواوەتی قڕیان تێ‌كەوتووەو ژمارەی گیانداره سێ‌پلەكانیش به زۆری كەمی كردووه چونكه بوون به خۆراكی ماسی .

له ساڵی ١٨٣٠دا زانایان مۆرچیسۆن‌و سید گویك پێكەوه ناوی دیڤۆنی‌یان دەربری به سەر كەفرەكانی ناوچەی دیڤۆنشێر له باشووری ئینگلتەره ، ئەمه بەر لەوەی كه ناكۆكی‌یەكه له نێوانیاندا روو بدات له سەر گیروگرفتی به یەكدا چوونی چینی كامبری‌و سیلوری . كەفرەكانی ناوچەی دیڤۆنشایەر نارێكن هەرچەنده كه بووبەردیشیان تێدایەو دەتوانرێت به هۆی ئەو بووبەردانەوه نیشان‌بكرێت‌و ستوری بۆ دابنرێت‌و جیا بكرێتەوه له سیلوری (كه له ژێری‌یەوەیه)و له كاربۆنی (كەلەسەری‌یەوەیه) . مۆر چیسۆن‌و سیدگویك بینیان كەوا دەتوانرێت سوود له بووبەردی ناوچەی (رینلاند) وەربگیرێت بۆ پێناسینی چاخی دیڤۆنی ، چونكه ئەم ناوچەیه بوو بەردی زۆرەو زۆریشی ئاشكراو بەدەرەوەن .

## چاخی‌كاربۆنی (خەڵوزیی Carboniferous Period :-

ئەم چاخه بەر له (٣٤٥) ملیۆن ساڵەوه دەستی پیْ‌كردووه نزیكەی (٦٥) ملیۆن ساڵی خایاندووه ، لێرەدا زەلكاو دەریای تەنكاو زۆربووەو ئاوو هەوا كەمێك گەرم‌بووەو ئاوی دەریاكان شلەتێن بووه ، ئەمەش یارمەتی بووژانەوەی ژیانی گیانەوەری داوه ، به تایبەتی ، گیانەوەری شیلان‌و پیْ بازوویی‌یەكان‌و پێست دركاویی‌یەكان‌و كراینوید (گیانداری نیمچەزەمەق Crinoidea شبه الزنبق : گیاندارێكی دەریایی‌یه له گوڵی زەمەق دەچێت)و پلاستۆیدو گیانداره تاك خانەیی‌یەكانی حيوانات وحيدة الخلية (Protozoa) وەكوو فۆرا منیفیرا Foraminifer =منخربات : گیاندارێكی سەرەتایی‌یه سەدەفەكەی كونكونه) . بەڵام له سەر ووشكانی ، گیانداره تەرووشكی‌یەكان (برمائيات Amphitia) هەر له گەشەكردندا بوون وجۆری تازەیان لیْ دەركەوتووه .

رووەك ، به تایبەتی درەخت ، زۆر بووەو زوربەی ئەم درەختانه دوای بوونیان به ژێر گڵەوه ، به تێپەربوونی وەخت ، بوون به خەڵوز (فحم Coal) . خەڵوزی ئەم چاخه گەورەترین عەماره بۆ پیشەسازی پوختەكردنی ئاسن له جیهاندا . گرنگترین درەختی ئەم چاخه لایكۆپۆدس Lycopodsو پتیریدۆسپێرمی Pteridosperms وكۆردێتس Cordaites بوون .

بەڵام مێروو (حشرات In sects) ژمارەكەیان زۆر بووەو جۆری قەباره گەورەیان لیْ‌پەیدابووه ، جاری وا هەیه باڵی هەندیكیان له مەترێك درێژتر بووه ، بۆ نموونه پوشكه بەقنگەی مەزن (يعسوب = سرمان Dragon Fly) . لەم چاخەدا گیانداره خشۆكەكانیش دەركەوتوون دوای ئەوەی كه له گیانداره تەرووشكی‌یەكانەوه گەشەیان كردووه . بەڵام ئەو گیانداره بیْ بربرانەی كه هەر له ئاودا دەژیان هەر بەردەوام بوون له سەر گەشەكردنی خۆیان به تایبەتی شیلان‌و نەرمۆڵەكان‌و تاك خانەیی‌یەكان‌و ئۆستراكودا (أوستراكودا Ostracoda) گیاندارێكی توێكلداری جومگەداره دوو سەدەفی (هەیه) و

ژمارەیەکی کەم لە گیاندارە سێ پلەکان کە بەرەوقرتێ کەوتن دەچوون .

دوو جیۆلۆجیستی بەریتانی (ولیام کۆنی بییر)و (ولیام فیلیپس) لە ساڵی ١٨٢٢ دائەم ناوەیان ناوە لەو چینەی کە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئینگلتەرەو مۆلگەی (کانە) خەڵوزی تێدایە . بەلام ئەم دوو زانایە وای دادەنێن کە دەشێت ناوی ئەم چاخە لە دوا رۆژدا بگۆرێت بە پیێی ناوی ئەو بووبەردانەی کە تیایدا دەدۆزرێتەوە .

چاخی پێرمی Permian Period :-

ئەم چاخە بەر لە (٢٨٠) ملیۆن ساڵەوە دەستی پیێ کردووەو نزیکەی (٥٠) ملیۆن ساڵی خایاندووەو جوری تازەی لە رووەك (وەکوو کاز = منوبر ) ومێروو . بە تایبەتی . جۆرەها قالۆنچەو مێشی کەتەی تیادا دەرکەوتووە . ماسی زۆر بووە وچەندەها جۆر لە گیاندارە شیردەرەکانی تیدا گەشەکردووەو گیانداری خشۆکی تازەی لە سەر ووشکانی (زەوی) تیادا دەرکەوتووە . ئەمانە گیانداری لە سەر ووشکانی (زەوی) تیادا دەرکەوتووە . ئەمانە گیانداری فیلە تەنو درندە بوون . بە تایبەتی . هەندێك جوری دیناسۆر وەکوو : دیمیترودۆن Dimtrodon وگیلنداری ئیدۆفۆسۆرس Edophosaurus ومیسۆسۆرس Mesosaurus جگەلە چەندەها جۆر لە مارمێلکەی کەتە .

لە کۆتایی چاخی پێرمیدا ژمارەیەکی زۆر لەو گیاندارو رووەکانەی کە لە چاخەکانی پێشوودا دەژیان قریان تیێ کەوتووەو لەهەمان کاتدا جۆری تازە هاتۆتە کایەوە . بەلام هەندێك (کەمێك) لە جۆرەکانی چاخەکانی پێشوو ئەوانەی کە بۆیان رێکەوتووە خۆیان بگونجێنن لەگەڵ باری ئاوو هەوای ئەم چاخەدا ، توانیویانە بۆ خۆیان لە ژیاندا بەردەوام بن لەم چاخەدا گیاندارەسێپلەکان بە تەواوی قریان تیێ کەوتووەو نەماونو ژمارەی ماسیو گیاندارە شیردەرەکانیش کەمی کردوون . ئاوو هەواش لە کۆتایی ئەم چاخەدا گۆرراوەو شوێنی ووشکانی تر لە سەر رووی خرۆکی زەوی دەرکەوتووە ئەویش بە هۆی کشانەوەی ئاوی دەریاکانەوە بووەو ، لە هەندێك ناوچەدا زەوی بیابان دەرکەوتووە . کە چی لەو وەختەدا سەهۆڵ بەشی خوارەوەی خرۆکی زەوی داپۆشیوە . جگە لەوەی کە لە کۆتایی ئەم چاخەدا رێزە چیای تازەدەرکەوتووەو بەرزبۆتەوەو ئەو چیایانەی کە لەوەپێشی بنی دەریابوون . لە ساڵی ١٨٤١دا زانا (مۆرچیسۆن) ئەم چاخەی ناونا بە ناوی ناوچەی پێرم Perm لە روسیادا . ئەم ناوچەیە چینی ئەستوری لە بەردی قسلێ تیادایە بە سەر چینە کاربۆنییەکانەوە . بەر لەوەی کە ئەم ناوەی لیێ بنێت مۆرچیسۆن بۆی دەرکەوت کە بووبەردەکانی ئەم ناوچەیە جیاوازییان هەیە لەوانەی کە لە چینەکۆنترو چینە تازەترەکاندا دەبینرێنو دڵنیابوو لەوەی کە دەشێت چینی پێرمی بکرێت بە چەند ناوچەیەکی جیاوازەوە بە پیێی جیاوازیی ئەو بووبەردانەی کە تیایدان .

چاخی ترياس Triassic Period :-

ئەم چاخە بەر لە (٢٣٠) ملیۆن ساڵەوە دەستی پیێ کردووە ونزیکەی (٤٩) ملیۆن ساڵ بەردەوام بووە . گۆمو دەریای تەنکاوی زۆر تێدابووە . بەلام دەربارەی ژیان خشۆکی یەکجار زۆر بووەو خشۆکی ئەوتۆ کە لە هینەکانی چاخەکانی پێشوو گەلێك پێشکەوتوتر بوون . بە تایبەتی هێلکەکانیان کە وایان لیێ هاتووە توێکلێ ئەستور بن بۆ ئەوەی کە بپارێزرێن لە گۆرانی باری ئاوو هەواو پەلامارادانی گیاندارە درەندەکان . ئالەم چاخەدا بۆ یەکەم جار لە سەر رووی زەوی گەلێك جۆری کەتە لە گیانداری دیناسۆر پەیدابووە هەروەها گیانداری بلیۆسۆرس Plesiosaurus و ئیکتۆسۆرس Ichthyosaurus کە هەر لە ئاودا ژیاوەو هەرگیز بە جیێ نەهێشتووە . هەروەها بۆ یەکەم جار جۆری تازە لە گیانداری شیلانو نەرمۆڵەو ئیسفەنجیو زەمەقیو پیێ سکی (بطنقدميات Gastropoda) وتەزبیحییەکانو پیێ جومگەییەکان (مفصليات Arthropoda) پەیدابووە . دەربارەی رووەکیشی گەلێك جۆری لە سەرووشکانی بلاو بۆتەوە وەکوو رووەکی سیکاد Cycads (کە لە دارخورما دەچێت) ورووەکە قوچەکدارەکان (مخروطيات – صنوبريات Coni Ferous)و چەند جۆرێك لە رووەکی کلکە ئەسپ (کەرەوزی بیر ختنار Ferns) . لەم چاخەدا گیاندارە شیردەرەکان دەستیان کردووە بە دەرکەوتن . لە ساڵی ١٨٣٤دا جۆلۆجستی ئەڵمانی (فەرەدریك فۆن ئەلبێرتی) ئەم ناوەی واتا ترياسی بۆ ئەو زنجیرە کەڤرەیەك لە دوای یەکەداناوە کە لە سێ چینی (قەدی) (ثلاثي التكوين) دیار پێکهاتووە ، ئەم جۆرە کەڤرە بە چاکی لە باشووری ئەڵمانیادا دەبینرێت بەلام بوو بەردی کەم تێدایە .

## چاخی جوواسی – Jurassic Period :-

ئەم چاخە بە ناوی چیای (جورا)وە لە فەرەنسە ، لە لایەن جیۆلۆجستی ئەڵمانی پێشەنگ (ئەلیکسا ندرڤون هەمبۆلت)ەوە لە ساڵی ١٧٩٥دا نراوە . ئەم زانایە چینەکانی چیای (جورا)ی لە باکوری سویسرە بە شێوەی یەکەیەکی سەربەخۆ پێناسین کردووە . ئەم چاخە بەر لە (١٨٠) ملیۆن ساڵەوە دەستی پێ‌کردووەو (٤٥) ملیۆن ساڵی خایاندووەو بە زۆریی گیانداری دینا سۆر ناسراوە ، کە شێوەو قەبارەی جیاواز یان هەبووە . هەندێکیان لە سەرزەوی‌و هەندێکیان لە ئاودا ژیاون ، هەندێکیان توانایی‌یەکی تەواویان هەبووە بۆ مەلەکردن ، جگە لەوەی کە گیانداری خشۆکی فڕندەی قەبارە جیاوازیشی تیادا پەیدا بووە ، لە زەریاکاندا گیانداری ئیکتۆسۆرس‌و پلیسۆسۆرس‌ی کەتەی دڕندە زۆر بووە ، سەرەرای ئەوەی کە جۆری کەتە لە گیاندارە تەزبیحی‌یەکان‌و جۆرە سەرەتایی‌یەکانی گیاندارە مەمکدارەکان‌و باڵندەی پتیرۆدا کتیل Pterodactyl usو ئەرکیۆ پتریکس ArchaeopteryX پەیدا بووە ، ئەمەبەکۆنترین جۆری باڵندە دادەنرێت ، مێرووش لەم چاخەدا یەکجار زۆر بووە لە هەموو ناوچەیەکدا ، جگە لە رووەکی کلکە ئەسپی مەزن .

## چاخی دەباشیری Cretaceous Period :-

ئەم ناوە Cretaceous لە لایەن جیۆلۆجیستی بەلجیکی (ئۆمالیۆس د . هالۆی)ەوە لە ساڵی ١٨٢٢ دادانراوە ، لە ناوە لاتینی‌یەکە دەباشیرە وە (chalk) وەری‌گرتووە . ئەم چاخە بەر لە (١٣٥) ملیۆن ساڵەوە دەسی‌پی‌کردووەو نزیکەی (٧٠) ملیۆن ساڵی خایاندووە بۆیە پی‌ی دەووترێت چاخی دەباشیری چونکە ئەو نیشتەنی‌یە کلس‌یانەی‌کە پی‌ی دەووترێت دەباشیر زۆر بووە لە چەندەها ناوچەی خرۆکی زەویدا . ئەم چاخە بەوە جیادەکرێتەوە لە چاخەکانی‌تر کە دەریا زوربەی ناوچەکانی خرۆکی زەوی داگیرکردووە . لەبەر ئەوە نیشتەنی دەریایی سەرەرای نیشتەنی کیشوەری (قاری) زۆر بووە بەر لەکوتایی‌ئەم دەریایی چاخە هەندێك جووڵەلە خرۆکی زەویداروویداوە بۆتەهۆی پەیدابوونی چەندەها ریزە چیای تازە لە هەندێك ناوچەی جیاوازدا . جگەلەوەی کەووشکانی بۆ یەکەم جار پڕبووەلەرووەکە گوڵدارەکان بە تایبەتی تۆو داپۆشراوەکان (مغطاة البذور Angiosperms) وماگنۆلیا Magnolia) و لاوریل (غار = laurel) . ئەمە بەرگە رووەکی‌یە رۆڵێکی گرنگی بووە لە بوژاندنەوەی ژیانی گیانەوەریدا ، بە تایبەتی ئەو خشۆك‌و باڵندەو شیردەرانەی کە لەسەر رووەك دەژین .لەم چاخەدا گیاندارە دیناسۆرەکان هەر بەردەوام بوون لە ژیاندا هەر چەندە کە نیشانەی قرتی‌کەوتنی هەندێکیان دەرکەوتووە . بەلاّم دەربارەی خشۆکە فڕندەکان گیانداری پتیرا نۆدۆن Pteranodon بە کەتە ترینی ئەو جۆرانە دادەنرێت کە خرۆکی زەوی دیبێتی بە درێژایی ئەو چاخانەی کە پیایدا تێپەر بووە هەتاوەکوو ئیمرۆ . لە دەریاکاندا گیاندارە کەتە درەندەکان زۆر بووە ، بە تایبەتی ئەو کێسەلە کەتەیەی کە پی‌ی دەووترێت ئەرچیلۆن (Archelon) کە هەندێك جار درێژی‌یەکەی گەیشتۆتە (٤) مەترو گیانداری پلیسۆسۆرس کە درێژی‌یەکەی گەیشتۆتە (١٤) مەترو مارمێلکە ئاوی‌یە کەتەکان . بەلاّم دەربارەی گیاندارە بێ بڕبڕەکانی وەکوو تەزبیحی‌یەکان وپی‌سکی‌یەکان‌و شیلان‌و زەمەقی‌یەکان‌و بیلمنایت Belcmnite (کەشێوەی لە گوللەچووە) ، ئەمانە هەر بەردەوام بوون لە سەر ژیانی خۆیان لە دەریا وتەنکاوەکاندا . گرنگترین باڵندەی ئەم چاخە باڵندەی ئیکثیۆرنیس (Ichyornis) وهێسپیرۆنیس (Hespcronis) بووە . لە کۆتایی ئەم چاخەدا چەندەها گیانداری وەکوو دیناسۆرو دوو لەپکەیی‌و شیلان قریان تێ‌کەوتووە ، هۆی ئەم قرتی‌کەوتنەش دەگەرێتەوە بۆ ئەو گۆرانە کتوپرەی کە لە بارەکانی ئاوو هەوادا رووی داوە جگە لە گۆرانی سروشت‌و جۆری ئەو مادە خۆراکی‌یانەی کە سەرچاوەی ژیان‌و بەردەوامی ئەو گیاندارا نەبوون .

## چاخی سێ‌هەم (الثالث)Tertiary :-

ئەم چاخە ئەم سەردەمانە (عصر Epoch) دەگرێتەوە :- پالیۆسین Palaeocene کە (٥) ملیۆن ساڵی خایاندووە ، ئیوسین Eocenc کە (٢٢) ملیۆن ساڵی خایاندووەو ئۆلیگۆسین Oligocene کە (١١) ملیۆن ساڵی خایاندووەو مایۆسین Miocene کە (١٢) ملیۆن ساڵی خایاندووەو پلیۆسین Pliocenc کە (١٢) ملیۆن ساڵی خایاندووە ، کەوابوو ئەم چاخی سێ‌هەمە بە سەریەکەوە (٦٢) ملیۆن ساڵ بەردەوام بوو . لەم چاخەدا

خشتەی وەختە جیۆلۆجی یەکان

جدول الأزمنة الجیولوجیة

| رووداوە گرنگەکان | Important Events |
| --- | --- |
| سەردەمی ئێستا دەرکەوتنی مرۆڤی نوێ . ئاوو هەوا مام ناوەندی یە جگە لە سەردەمە سەهۆڵینەکان . گیاندارە شیردەرە | |
| مرۆڤی سەرەتایی (مرۆف مەیمون) . چیای بەرز . رووەکی نوێ | |
| مرۆڤی سەرەتایی شیردەر نزیکن لەوانەی ئێستا . پەیدابوونی دەشت بەرزبوونەوەی چیای ئەلپ و هیمالایا گەشەکردنی درەختی نوێ | |
| گۆرانی ئاوو هەوا بەرەو ساردی . ئاووی هەوای ووشك دەرکەوتنی سەگ . | |
| زۆربونی شیردەر کەتەکان سەرەتای پەیدابوونی چیای ئەلپ و هیمالایا . دەرکەوتنی بەراز . دەرگەوتنی رووەکی ناوچە فێنەکە | |
| زۆربوونی مێروو سەرەتای دەرکەوتنی ئەسپ و شەمشەمە کوێرە . گیاودەوەن | |
| دەرکەوتنی فیل و نەهەنگ | |
| گەشەکردنی گیانداری دیناسۆر . زۆربوونی باڵندە پەیدابوونی نیشتەنی بەردی کلس . دەرکەوتنی رووەکە گوڵدارەکان | |
| ئاوو هەوایەکی خۆش رێکوپێك . پەیدابوونی بەردی ئاسنین زۆر بوونی گیاندارە خشۆکەکانی ناوئاو . دەرکەوتنی باڵندە دداندارەکا | |
| بیابانی فراوان دەرکەوتنی مارمێلکەکان دەرکەوتنی رووەکی سیکادوسنەوبەر | |
| باری ئەووهەوای بیابانی دەرکەوتنی گیاندارە خشۆکەکان و شیردەرەکان . سەرەتای کیسەڵ . کۆتایی گیاندارە سێ پلەکان . | |
| پەیدابوونی خەڵوزی بەردین لە زەلکاوەکاندا ، مێرووە سەرەتایی یەکان گیاندارە لتەرووشکی یەکان . بیشتەنی ئەستور لە بەردی مسل | |
| ئاوو هەوای ووشك زۆربوونی ماسی . گەشەکردنی مێروو جاڵجاڵۆلە سەرەتای رووەکە بەردارەکان . نیشتەنی لە ب ردی لمن سور | |
| ئاوو هەوای گەرم سەرەتای ماسی . دوو پشکی دەریایی گەورە دەرکەوتنی بێشەلانی زەلکاوەکان پەیدابوون شیلان و سەدەف | |
| ئاوو هەوای فێنك دەرکەوتنی جۆرەها لە گیاندارە بێ بربرەکان و سەرەتایی یەکان و گیای دەریایی . | |
| کەش بە شێوەیەکی گشتی خۆش و رێکوپێکە . دەرکەوتنی گیاندارە سێ پلەکان . | |
| خانەی زیندووی سەرەتای ، باکتریا . چوزەوارەو قەوزە | |
| کۆنترین کەڤری ناسراو ، پەیدابوونی زەوی | |

تێبینی : (١) ئەم خشتەیە لە ساڵی ١٩٦٨دا دانراوە (٢) تەمەنی وەختە جیۆلۆجی یەکان بە رێگەی تیشکی دۆزراونەتەوە ٣ توێکلی زەوی بەر لە ٤٦٠٠ ملیون ساڵەوە پەیدا بووە .

## جدول الازمنة الجيولوجية

| | دێرین Era | چاخ Period | سەردەم Epoch | دەست‌پێ‌کردن لەملیۆنەها ساڵەوە | خەیاندن بەملیۆنەها ساڵ |
|---|---|---|---|---|---|
| | Ceno Zoic دێرینی ژیانی نوێ دهر الحياة الحديثة | Quaternary چوارەم | هۆلۆسین | ١٠ هەزار ساڵ | ١ هەزار ساڵ |
| | | | بلیستۆسین | ٢/٥ | ٢/٥ |
| | | سێ‌هەم | پلایۆسین | ٧ | ٤/٥ |
| | | | مایۆسین | ٢٦ | ١٩ |
| | | Tertiary | ئۆلیگۆسین | ٣٨ | ١٢ |
| | | | ئیوسین | ٥٤ | ١٦ |
| | | | پالیۆسین | ٦٥ | ١١ |
| | Mezozoic دێرینی ژیانی ناوەراست دهر الحياة الوسطى | cretaceous دەباشیری | | ١٣٦ | ٧١ |
| | | Gurassic جوراسی | | ١٩٠ | ٥٤ |
| | | Triassic ترياس | | ٢٢٥ | ٣٥ |
| | Paleozoic دێرینی ژیانی کۆن دهر الحياة القديمة | Permian پێرمی | | ٢٨٠ | ٥٥ |
| | | carboniferous کاربۆنی (خەڵوزی) | | ٣٤٥ | ٦٥ |
| | | Devonian دیفۆی | | ٣٩٥ | ٥٠ |
| | | Silurian سیلوری | | ٤٣٠ | ٣٥ |
| | | ordovicician ئۆردوفیس | | ٥٠٠ | ٧٠ |
| | | cambrian کامبری | | ٥٧٠ | ٧٠ |
| | Precambria قبل الكامبري بەر لە کامبری | Era دێرینی ژیانی سەرەتایی Proterozoic | | ٢٠٠٠ | |
| | | Archeozoicera دێرینی ئەرکی (هەرەکۆن) | | ٤٦٠٠ | ٤٠٣٠ |
| | | | | | |

گیانداره شیردەرەکان زۆر بوونو له زوربەی گیاندارەکاندا رەوشتی گونجان (تکیف Adaptation) بۆ ژیانی ناووشکانیو ئاو هەواشی له هەمان کاتدا دەرکەوتووە . بەلاّم گیانداره بێبڕبڕەکانی ئەم چاخه کتومت هەروەکوو ئەمانەی ئەم وەختەی ئێستا وا بوون . لەم چاخەدا هەستیارەکان (حواس Senses) وژیریی (عقل)و پەلو ددانی گیانداره شیردەرەکان بەرەو گەشەکردن چوون ، ئەسپو فیلی کۆن ووشترو سەگو مەیمونی پرۆکۆنسول Proconcul ویوینتا ثیرۆم Uintatherium (که له کەرەکەدەن چووه) . . .هتد باشترین نموونەن بۆ ئەمە .

ئەم ناوه Tertiary له لایەن زانا ئەردوینۆ Arduinoوه له سالّی ١٧٦٠ دا دانراوەو به فراوانی بەشکراوه به (٥) سەردەمەوه . زاناکوڤیر Cuvier چینەکانی ئەم چاخەی خستبووه ژێر لێکۆڵینەوەی خۆی له دولیّ پاریسدا به پیّی ئەو گیانەوەرانەی که تیایدا بوون . ئا لەم چاخەدا بووه که ریزه چیاگەورەکانی وەکوو ئەلّپو هیمالایا دەرکەوتوون . ناوی ئیوسینو مایۆسینو پلیۆسین له لاەین زانا (چارلس لیل) ەوه له سالّی ١٨٣٣دا لەبەر رۆشنایی ژیانو ئەو بووبەردانەی کەلەوسەردەمانەهەبوون دانراوه . بەلاّم ناوی ئۆلیگۆسین له لایەن (ئۆگەست ڤۆن بریچ)ەوه له سالّی ١٨٥٤داو ناوی پالیۆسین له لایەن (ویلهلم شیمپەرەوه) له سالّی ١٨٧٤ دانراون .

چاخی چوارەمم (الرابع) Quaternary :-

ئەم چاخه سەردەمی سەهۆلّی (العصر الجليدى Pleistocene) وسەردەمی تەواو تاوه (الحديث التام Complete recent) واتا هۆلۆسین دەگرێتەوه .

نزیکەی ملیۆنێك سالّ لەمەوبەر دەستی پیّکردووەو مەزنترین خشانی (هێرش) سەهۆڵ ەسەر خرۆکی زەویدادیوه ، له ئەوروپاو له ئەمەریکادا ، ئەوه بووه سەهۆلّ زۆربەیو وشکانی رووی خرۆکی زەوی داپۆشیوه به جۆرێکی ئەوتۆ که هەندێك ئەستورایی چینی سەهۆلّه که گەیشتۆته نزیکەی (٣) هەزار مەتر . بەلاّم لەم سەردەمی سەهۆلّیەدا جار ناجارێك سەهۆلّەکه تواوەتەوەو وەکوو زانراوه خرۆکی زەوی به چوار قۆناغی سەهۆلّیدا تێپەڕبووەو چوار قۆناغی نا سەهۆلّیشیان (بیّ سەهۆلّی) له نێوانّدا بووه . له قۆناغه ناسەهۆلّیەکاندا ژیانی گیانەوەرییو رووەکی سەر له نویّ بووژاوەتەوه . گرنگترین ئەو گیانەوەرانەی که له قۆناغه ناسەهۆلّیەکاندا بوژاونەتەوه بەرازو ووشترو فیلی ماموثو گورگو رێویو پلّنگی کەلّبه خەنجەر (نمر خنجري الناب Sabre – tooth tiger) بوون .

ئادەمیزادیش به زیرەکترینی گیانداری ئەم چاخه دەژمێررێت چونکه توانیویێتی ، هەتا ئیمرو ، خۆی بۆ ژیان بگونجێنێت .

له سالّی ١٨٢٩دا زانا (جولیس دێسنۆیەرس ) ئەم زاراوەیەی Quaternary له دۆلّی پاریسدا دانا بەرامبەر بەو مادە نیشتەنیو بورکانیەی هەمە جۆرانەی که دوا به دوای یەك هاتوونو به تازەتری دادەنان وەك له کەڤرە سیّهەمەکان (Tertiary) بەلاّم ناوی پلیستۆسین له لایەن زانا (لیل)ەوه له سالّی ١٨٣٩ دا وناوی هۆلۆسین (سەردەمی هەره نویّ) هەرله لایەن زانا (لیل)ەوه له سالّی ١٨٣٣ داپێشنیار کراون .

هەندێك زاراوەیتر :-

هەندێك چاخ به شێوەیەکی خۆمالّی (ناوچەیی) ناویان لیّ نراوه بۆ نموونه : جیۆلۆجیستەکانی باکووری ئەوروپا له جیاتی زاراوەی چاخی سیلوری چاخی گۆتلاندی (Gotlandian Period) بەکاردەهێنن . هەروەها زاراوەی ئیوجین Eogeneو نیوجین Neogeneو پالیۆجین Paleogene به شێوەی چاخ له دێرینی سینۆزۆیکدا بەکاردەهێنرێن ، به تایبەتی له ئەوروپادا ، و دەخرێنه سەر لوتکەی سەردەمی ئۆلگیلۆسین هەندێك له زاناکان بەم جۆره چاخی خەلّوزی (کاربۆنی) یان جیاکردۆتەوه :-

أ – چاخی میسیسپی : Mississipian Period :-

ئەم زاراوەیه له سالّی ١٨٧٥دا له لایەن (ئەلیکساندرو ینچیل)ەوه بەرامبەر به چینه خەلّوزیيه دیارەکەی ژێرەوەی دۆلّی میسسپی داناوه .

ب – چاخی پەنسلڤانی : Penny sylvanian :-

له سالّی ١٨٩١دا (هەنری شیلەر ویلیامس) ئەم زاراوەیەی بەرامبەر به چینه خەلّوزیيەکەی سەرەوەی دۆلّی میسسپی له ناوچەی پەنسلڤانیادا داناوه . هەروەها هەندێك له زاناکان سەردەمەکانی (پلیۆسینو پلیستۆسینو هۆلۆسین)یان له ژێر ناوی

..ری ئادەمیزاد (دهر الانسان) Anthropozoicدا داناوە جۆرێکە لەم سەردەمانەدا مرۆڤ پەیدابووە .

تێبینی :

هیوادارم کە لە ووتارێکی داهاتوودا بەر دوورودرێژی باسی جۆرێتی قەبلاندنی کەڤرو بووبەردەکان بکەم ، کە ئەمەش ..نگەیەکی بنچینەیی یە بۆ قەبلاندنی تەمەنی وەختە جیۆلۆجی یەکان .

سەرچاوەکانی ئەم ووتا..:


١ – الجيولوجيا للجميع / تأليف، عادل حاتم جوزي من منشورات وزارة الثقافة والاعلام / دار الرشيد للنشر سلسلة الكتب العلمية (٦)

دار الحرية للطباعة / بغداد ١٩٨٠

٢ – مبادئ علم الأرض (الجيولوجيا) تأليف :–

دكتور جلال الدين حافظ عوض – دكتور يحي محمد انور دكتور محمد العربي فوزي

جامعة الاسكندرية – دار المعارف بمصر /١٩٦١

٣ – جيولوجية شمال العراق / تأليف الدكتور فاروق صنع الله العمري والدكتور علي صادق طبع بمطابع مؤسسة دار الكتب للطباعة والنشر جامعة الموصل /١٩٧٧

٤ – معجم مصطلحات البترول والصناعات النفطية انكليزي – عربي

تأليف احمد شفيق الخطيب

مكتبة لبنان /١٩٧٥

٥ –

The New Encyclopedia Britannica Volume 7

15TH EDITION

1973 – 1974


# شێخ نوورالدین قوتابی‌و برا بچووکی

## مەلا محەمەدی کۆیی


بێستون محمد علی




مامۆستا شێخ نوورالین کوری (حاجي مەلا عبدالله )ی جەلی زادەیە لەساڵی ١٨٨٢ زاینی لەشاری کۆیە هاتۆتە دونیاوە دایکی خاتو (زەینەب)ە نازناوی حەزینەیە دەستێکی باڵای هەبووە لە هۆندنەوەی شێعرو زمانی فارسی‌و عەرەبی بە بەلاغەتەوە زانیوە .

بنەماڵەی ئەم زاتە لە (٣٠٠)سێ‌صەد ساڵ لەمەو بەرەوە خەریکی زانست‌و زانیاری ئاینی بووون بەربەرەکانی یەکی تەواوی نەخۆشیەکانی ناو کۆمەڵیان کردوە بەتایبەتی نەخوێندەواری‌و جادووگەری لەژێر پەردەی ئاینەوە .

باوکی زۆری خۆش ویستوە جارێکیان مەلای گەورەی برای دبینێ کەواکەی شێخ نووری تەڕ بووە روو لەباوکی دەکاو دەڵێ ئەو شێخە چ شێخێکە کەوای تەڕ بوو لەئاوا ؟ جێ بەجێ باوکیان وەڵامی دەداتەوە دەڵێ : ئەو شێخە برای تۆیە وەکو نوورە لەچاوە

سەرەتای خوێندنی لە سوختەخانەی : (حاجی فەقێ محەممەدی رۆمی ) دەست پێ‌کردوە دوای ئەمە لەك برای گەورەی «مەلامحەمەدی کۆیی » کە ناسراوە بە مەلای گەورە خوێندوویەتی أیجازەی عیلمی لەو وەرگرتوە . پاش وەرگرتنی أیجازەی عیلمی بەپلەیەکی‌زۆر بەرز ، ژنیان بۆ خواستوە لە ساڵی ١٩٠٨ ی زاینی فاطمەی کچی شێخ‌مەعروفی شێخ عبدالکریمی کۆی‌یان بۆهێناوە ئەمکاتە لە گوندی (هەرەجە)ی نزیك هەولێر دانیشتوون .

پاش ئەوەی مەلا عەبدوللای باوکی کۆچی دوایی دەکات مەلای گەورە هەست دەکا کە هەندێ ناحەز خەریك دەبن برایەتیان ئێك بدەن وە شوێن گرتنەوەی باوکیان بەهەل دەزانن ، چونکی دایکیان جیاواز بووە ، لەبەرئەوە مەلای گەورە بە مامۆستا شێخ نووری برا بچووکی ئەڵێ : نوورالدین ئەگەر برا گەورەییت دەوێ فەرموو وەرە لەجێ‌ی باوکیان دانیشە چوونکی ئەم‌کات لەبەر زانایی‌و خوێندەواری بەرزی عالمو ئیمامو مەلای کۆیە بووە وە پەیمان بێت هەر خزمەتت بکەم خۆ ئەگەر قەبووڵیش ناکەی خۆشەویستم شتێکی وا نەکەی ناحەزمان پێ‌خۆش بێت‌و برا بچووکی باش بە . . .

شێخ نووری هەردوو دەستی کاکی ئەگوشی‌و کرنۆشی بۆدەباو ئەڵێ جەنابت پێش‌ئەوەی برام بی تۆ مامۆستای منی‌و لەسەر دەستی جەنابت ئیجازەم وەرگرتوە ئەوپەری شانازیمانە لەشوێن باوکم دانیشی ئەو رۆژگارانەم لەیاد ناچی کە خۆتان لەگەل ماندوو دەکردین‌و منو قوتابی‌یە ئاوەڵەکانمت بەیەك چاو تەماشا دەکردو ئاموزگاریت دەکردین ، ئاوەڵەکانیش ئەمانە بوون : —

١ — مەلا صدیق کوری مەلا عەبدوڵلای نازەینی پاش وەرگرتنی ئیجازەی عیلمی کلیە حقوق تەواو کردوە بووە بەحاکم .

٢ — مەلاصادق کوری مەلا ئەحمەد پاش ئەوەی ئیجازەی عیلمی وەرگرتوە بووە بەمفتی رانیە دوایی بووە بە مامۆستای دەرس گوتنەوە لەمزگەوتی مەلاجامی لە کۆیە .

٣ — مەلا عبدالرحمن : پاش وەرگرتنی ئیجازەی عیلمی بۆ دار المعلمین چووە پاش تەواوکردنی بووە بەمامۆستا دوایی ناسراوە بە عبدالرحمن شەرەف .

٤ — مەلا عەلی باداوەیی : لەگوندی باداوە بۆ وەرگرتنی عیلم هاتوتە کۆیە پاش وەرگرتنی ئیجازەی عیلمی بووە بە مامۆستای مزگەوتی منارە لە کۆیە .

ئیتر لەم رۆژەوە تا دوایی ژیانیان دڵیان لێك نەشکاوە وەکو باوکو کور وە مامۆستاو سوختە بووون .

لەساڵی ١٩١٩ یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی لەکۆیە کرایەوە زۆر لەکۆنەپەرستەکان وە لەژێر پەردەی ئاینەوە و وە هەندێك لەنەفامیەوە بەربەرەکانیان کردوو سەرەرای ئەوەی منداڵەکانی خۆیانیان نەدەنارده قوتابخانە پرۆپاگندەشیان دژی‌قوتابخانە دەکرد لەم‌کاتەش دا جەنابی مەلاگەورە لەکۆیە قاضی‌بوو و فەرمانی بۆ مەلاعبدالرحمن شەرەف دەرکرد کە ببێ بە بەرێوەبەری ئەم قوتابخانەیە و شێخ نوورالدین ببێ بەمامۆستای وانە ووتنەوە لەرۆژی ١٩٢١/٩/٢١ فەرمانەکە دەرچو ئەم ٣سێ‌پیاوە ناودارانە بەرامبەر بەم هوموو کۆنەپەرستانە وەستان‌و بۆهەموو دانیشتوانی کۆیەیان روون کردەوە کە قوتابخانە چ دەورێکی کاری‌گەری هەیە بۆ پێش‌کەوتن‌و وورپابوونەوە جەنابی مەلا نەك هەر کورەکەی‌ناردە قوتابخانە بەڵکو نەجیبەی کچیشی نارد ئەمە لەخۆی‌دا بەنیسبەت ئەمسەردەمە شورشێك بوو . شێخ نوورالدین پانزە سال لەم قوتابخانەیە ئەم وانانەی دەووتەوە کوردی ، عەرەبی ، ئاینی ئیسلام ، لەساڵ ١٩٢٣ جەنابی مەلای گەورە بوو بە ئەندامی ئەنجوومەنی دامەزراندنی عیراق (مجلس تأسيسي) لە بەغدا شێخ نوورالدین کرا بە جێگری واتە قاضی بۆ ماوەی شەش مانگ سەرەرای مامۆستایەتی قوتابخانەی دوای ئەوەی رۆژی دوو وانەی دەگوتەوە دەچو بۆ دادگا بریارەکانی زۆر راست‌و دورست بوون تاکوئێستاش بریارەکانی لە سجلاتی دادگای کۆیە ماون بۆ وێنە جارێکیان محاکەمەیەك دەکاو بەپێی یاسای ئەم‌کات‌و پاش دڵنیایی خۆی بریاری لەسەر دەدا پاش ئەوەی سەرەنجامی بریارەکان دەنێررێنە هەولێر بۆلای حاکمی (منفرد) کە خوا لێ‌خۆش‌بوو «مەعرف‌جیاوك» دەبێ ئەویش بەبێ چاو پێداخشاندن و لێ‌وردبوونەوە راستەوخۆ رەددی دەکاتەوەو دەیگەرێننەوە کۆیەو وێنەش دەدا بە وەزارەتی عەدلی‌یە دیسان شێخ نوورالدین سوور دەبێ لەسەر بریارەکەی‌و دەچێتە هەولێر (حاکمی منفرد) مەعرووف جیاوك دەبینێ‌و پێ‌ی دەلێ ئەم دەعوایەت بۆچ رەفز کردوە ئایا فلان ماددەت خوێندووتەوە ؟ تکایە بفەرموون با بێت‌و لێ‌ی وورد بینەوە . پاش ئەوەی مادة قانوونی‌یەکە تەماشا دەکەن و لێ‌ی دەکۆڵنەوە مەعرووف جیاوك هەڵدەستێ ناوچەوانی شێخ نوورالدین ماچ دەکاومصافحەی لەگەل دەکاو داوای لێ بووردنی لێ‌دەکات وەدانی پیانا کە هیچ نەی خوێندبۆوەو ووتی

وە دەزانی کەسێکی کە نی‌یە وەك جەنابی مەلای گەورە وا شارەزای قانوون بێ بۆیە بەبێ ٣ی و دوو رەفزم کرد ئیتر شەرت بێ و دەرس بێت لەمەودوا هەموو شتت بەووردی بخوێنمەوەو جێ بەجێ پاشکۆیەك دوا بەدوای رەددەکە بۆ وەزارەتی عەدلی‌یە دەنووسێ دەست بەجێ دەی نێرێ شێخ نوورالدین دوا بەدوای ئەوە بە مەعرووف جیاوك دەڵێ هەموو مێزەر بەسەرێك یەك‌نین ئەم مێزەر بەسەرەی ئەم بڕیارەی داوە قوتابی مەلای گەورەیەو شارەزای یاسایە پاش‌ئەمە دۆستایەتیان زۆر بەهێز دەبێ و ئەڵێ بەراستی دانیشتوانی کۆیە زۆر بەیان رۆشنبیرن ئەتوانم بڵێم کۆیە خۆی لەخۆی‌دا قوتابخانەیەکی تایبەتیە جێگای شانازی‌کردنە وە من کە حاکمم وا چاکترین دەرسم لەم کۆیەیە وەرگرت ئەوێش ئەوەیە لەمەو دوا فێری ئەوەی کردم کە لە هەموو خوێندنەوەکانم وورد بم و هیچ شێك پشت گوێ نەخم وە لەخۆڕا بڕیار نەدەم دووبارە سوپاستان دەکەمەوە .

شێخ نوورالدین پاش پانزەساڵ دەرس وتنەوە گواستراوە بۆ گوندی خۆران لەناوچەی خۆشناوەتی لەوێ یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی کراوە پاش‌ئەمەی فەرمانی بوونە بەرێوەبەرایەتی ئەم قوتابخانەی بۆدەرکرا وەکو سەربازێکی نەناسراو بەبێ سێ و دوو رووی کردە گوندی خوران‌و سەرپەرشتی قوتابخانەکەی کردو دەستی کرد بە دەرس ووتنەوە ماوەیەك لەوێ ماوە پاش ئەوەی جەنابی مەلا کۆچی دوایی کرد ئەمەش لەساڵی ١٩٤٣ بوو بڕیاردرا کە شێخ نوورالدین ببێ بەجێگری ئەو وەهەر خۆشی بوو بە مامۆستای مزگەوتی مەلائەسعەدی باپیری وەلەوێ ژمارەیەکی بێ ئەندازە قوتابی لێ‌بوو لەهەموو ناوچەکانی کوردستان بۆی هاتبون ناچار بوو کەخۆی دەرسیان پێ‌بلێ و ئەم دەرسانەی دەووتەوە : —

زمانی کوردی ، تەفسیری قورئان ، نحو و صرف ابن الحجر ، تفسیری بیضاء ، علم المنطق وە ئەم مەلایانە خوارەوە لەژێر دەستی ئەو ئیجازەی عیلمی مەلایەتیان پیدراوە : —

١ — مەلا مەعرووف کوری حاجی سولەیمانی مەریوانی
٢ — مەلا ئەحمەدی مەلا عەزیزی پشدەری
٣ — مەلا ئیبراهیمی شێخ نجم الدینی بیراوە
٤ — مەلا فتح الله شوان ئیمامی مزگەوتی خادیم لە کۆیە
٥ — مەلا مستەفای کوری طەهای ئاوماری
٦ — مەلا شێخ محەمەدی خۆشناوەتی
٧ — مەلا رەئووف سەلیم ئاغای کۆیی
٨ — مەلا محمدرامین کوری عبدالکریمی کۆیی
٩ — مەلا عەلی ملا عبدالرحیمی ئیمامی‌مزگەوتی کۆنەجمعە
١٠ — مەلا صالح ئیمامی مزگەوتی مفتی لە کۆیە

لەبەر شارەزایی‌و زیرەکی‌و ناسراوی شێخ نوورالدین لەهەموو ناوچەکانی کوردستان ئەگەر مناقەشەیەك بکرابا وە لەئەنجاما نەگەیشتبانە نەتیجەیەك دەهاتنە لای ئەو وەدەیان‌کرد بە حەکەم‌و مسألەکەیانی بۆ یەك لا دەکردنەوە وەئەوەی ئەو بڕیاری لەسەر دابا هەموو لایەك پێ‌ی رازی دەبوون‌و لەسەری دەرۆیشتن چونکی چونکی جێگای باوەری هەموولایەك بوو .

ئەوەی شایانی باسە خوالی‌خۆش‌بوو تاکو مردنیش نانی فەقێ‌یایەنیو مەلایەتی نەخواردوە بەلکو بەبەرو بوومی باخچەکانیان لە چناروك‌و جەلی ژیاوە هەندێ ساڵیش برنجیان کردوە لەدەم رووباری قەرەنیاغا لەدەشتی بیتوین ، واتە ژیانیان زۆر سادەو نەمروو نەژی بووە سەرەرای ئەوەش چاوتێرو بەمێوانداری بووە .

خوالی‌خۆش‌بوو زۆر ئاشنایەتی هەبووە لەگەل مامۆستای نەمر پیرەمێرد هەردەم ئاگایان لێك بووە زۆر لە گفتو گۆیەکانیان لە رۆژنامەی ژین بلاو کراونەتەوە لەتەمووزی ١٩٣٥ لەلایەن پیرەمێردەوە بەخێر هاتنێکی گەرم کراوە وەلە ژمارەی ئەم مانگەوا باسی‌کراوە .

شێخ نوورالدین زۆر تەردەست بووە لەوەلام دانەوەدا وەلامەکەشی مایەی دلخۆش هەموو گوێ‌گران بووە جارێکیان لە خزمەت (سیداحمدی خانقاە )دەبێت لەکەرکووك پاش ئەوەی زۆر خزمەت ئەکرێن دوایی هەلدەستن برۆن دەگەنە دەرگای دەرەوە جەنابی (سید احمد )بە شێخ نوورالدین ئەلێ نوورالدین بەخوا پێم خۆش بوو بەردێکت بە شوێندا هەلدەم (شێخ نوورالدین) یش دەست بەجێ وەلامی ئەداتەوەو ئەلێ خۆزیا تۆ سێ بەردت هەبوایە ئەوجا بەردێکت بۆمن هاوێشتبا شێخ دی‌زانی سید احمد ژنی مردووەو رەبەنە ، دەبێتە پێ‌کەنین‌و دەلێ دەرووەستتان نایەم .

شێخ نوورالدین زۆر ئارەزووی چاخواردنەوەی هەبووە جارێکیان لە قۆناغێك دەبن‌و یەکی لە برادەرەکانی لەگەلا دەبێ شەو خەویان نایەت چایەیان بۆ سازدەدەن دوای ئەوەی چا دەخۆنەوە شێخ ئەفەرموێ چای‌کەبۆ برادەرەکەم بێنن چایەچی‌یەکە هەرچا دێنێ کاتێك ماندوو دەبێ دەلێ یاشێخ ئەم برادەرەت زگاو نەبوو خۆ من دستم شل‌بوون برادەرەکەی

هەڵی دایەو ووتی بەخوا هەر ناوبەدی‌یەکە بۆمنە بەلام چایەکان بۆ شێخە . . ! دەبێتە پێ‌کەنین .

کۆچی دوایی شێخ نوورالدین .

لە تەمووزی ساڵی ١٩٥٢ لە گەڕانەوەی بۆماڵەوە شێخ نووچی ئەداو دەکەوێ بەرێکەوت ناوچەوانی بە دیوارێکی بەرامبەری دەکەوێ‌و دەبێ بەبرین لەمەکاتەدا دەرزی نەخۆشی کەزاز لە نەخۆشخانەی کۆیە نابێت برینەکەی وورده وورده تەشەنە دەکاو چاك نابێتەوە پاش چەند رۆژێك دەی‌بەن بۆ هەولێر لەوێت پاش تەداویەکی زۆر دیسان چارەی ناکرێت لەنەخۆشخانە دێتە دەرەوە خانوویەکی بۆ بەکرێ دەگرن هەموو رۆژ دکتۆر هاموو شۆی دەکا بەلام بەبێ‌سوود .

تواناشیان نابێت بیبەن بۆ دەرەوە یان شوێنێکی کە بۆ چارەسەری تاکو شەوی چوارشەمووی ١٩٥٥/٨/٢٠ گیانی پاکی بەخاکی کوردستان ئەسپێری‌و هەر لەگەل بیستنی وەفاتی زۆربەی دانیشتوانی کۆیەو دەوروپشتی بەرەو پیری تەرمەکەی دێن‌و .

ژمارەیەکی زۆر لە رۆشنبیرو ناودارو پیاوە ئاینی‌یەکانی هولێر لەگەڵ تەرمەکەی دێن بۆ کۆیەو لەپاش نیوەرۆی رۆژی چوارشەممە لەگۆرستانی دەروێش‌خدر لەتەك مامۆستاو برای گەورەی ئەینێژن ، هەزار سلاو لەگیای پاکی شێخ نوور الدین بێ کە لەمساوە هەر خزمەتی نەتەوەو گەلەکەی کردووەو هەردەم هەوڵی داوە میللەتەکەی بەسەر بەرزیو سەرفرازی بژیت .

سەرچاوەکان

ئەم مەعلوماتە لە مامۆستای بەرێز عبدالمجید شێخ نوورالدین وەرگیراوە .

# مێژووی ژیانی هونەرمەندی (ژن) شەریفە ئاغای نەمر

شەریفە ئاغای هونەرمەندو سوار چاکی کورد ...
(شیرین)ە کچی (بێبۆ)ی کوری (کەلۆ) یە لە خێڵی هەرکی ...
بە شەریفە شەرۆ ناوبانگی دەرکردبوو لە نێو خێڵەکەیداو ...
هونەرمەندانی ئەو سای کوردا وەك کاوێس ئاغا ، عەلی مە...
پالانی . عەزیز ئاغا قەوان ، حەمەد ئاغامەندو حەسوۆ حە...
کۆر .

شیرین لە پاییزی ساڵی ١٨٩٥ دا لە رێگادا لە دایك دەبێت ...
خێڵەکەیان لەکوێستان بەرەو گەرمیان دەگەرانەوە دایکی ش...
ناوی (بەگی) بووە .

شیرین هەر لە منداڵیەوە پەروەردەی ئاوو هەوای خو...
سازگاری کوێستانە دلفرێنەکانی کوردستان بووە وەك گەو...
مەرگەوەرو دەشت‌و دەشتی براندیزو چارچەلی هەرکیان کە ...
بەهەشتێکی سەررووی زەمینن . . .

شیرین تاتەمەنی (١٢) ساڵی جلی ئافرەتان دەپۆشی‌و
پاشدان جلی ئافرەتان فرێ دەداو قژەجوانەکەی دەبڕی‌و
پیاوان لە بەردەکات‌و چەکیش هەڵدەگری‌و دەبێتە شوان ...
دەم شوانی‌یەوە بۆ دڵ‌خۆش‌کردن‌و دامرکاندنەوەی داخی ...
دەروونیەوە بە لاوك خەم ودەردو پەژارەی دڵی خۆی ...
رشتووە .

## جلال ملا حسن خوشناو

تیرین که جلی پیاوان لەبەر دەکات ناو بانگی بە (شەریفە شەرۆ) دەردەکات . شەرۆ واز لە شوانی دەهێنێو دەبێتە پیاوو چەك هەلگری (ئەحمەد خانی هەرکی) کەبتان (های) لە کتێبی (ستان في كردستان) (الجزء الثاني – صفحه (٣١) دەڵێ : لە ساڵی ١٩١٨ – لە گوندی (دێرێ) چاوم بە ئەحمەد خانی هەرکی کەوت ژنێکی لەگەل دا بوو جلی پیاوانەی لەبەربوو پێیان دەگوت (شريف ژن) . های دەڵێ : (ئەم ئافرەتە بالأبەرزو لاوازبوو بەلأم سینگێکی پانو بەرزی هەبوو،هەمیشە جلی پیاوانەی لەبەردەکردو تفەنگكو رختەی دەبەست وەك پیاوێکی بە هێز وا بوو ، هەمیشە لەگەل ئەحمەد خانی هەرکی دابوو) .
پاش مردنی ئەحمە خانی هەرکی شەرۆ لە لای چەند سەرۆکی هۆزی هەرکی ژیانی خۆی بردوتە سەر وەکو نعمەت خان ، طاهر ئاغا ، طە ئاغا ، نورۆ قورشید ئاغا ، فەتاح ئاغا . شەریفە ئاغا زۆر جار دیدەنی (سمایل ئاغای شکاکی) کردووەو لاوکی بۆ گوتوە . .

ئەسپی شەریفە ئاغا ناوی (مشکۆ) بوە . شەریفە ئاغا لە دوا پاییزی ساڵی ١٩٥٧ دا کۆچی دوای دەکات لە کوێستانی (وارخاتوون) وەلە مەزارگەی (مام شێخان) دەشاردرێتەوە . . لە کوردستانی ئیران .

– شەریفە ژن ، ژن دەهێنێ

شەریفە ئاغا دەکەوێتە داوی دلداری کچێکی شوخو جوانی خێڵەکەی کە ناوی (خۆخێ) بوە لە گوندی (مامۆندیان)[١] جیٚ نشین بووە .
شەریفە ئاغا بۆ خوازبێنی (خۆخێ) داوا لە (سەیدطە)[٢] دەکا کە برایەکانی خۆخێ رازی بکات ، سەید طە داوا لە برایەکانی کچە دەکات ، ئەوانیش رەزامەندی خۆیان نیشان دەدەن ، ئنجا شەریفە ئاغا خۆخێ مارەدەکاتو دەیگوازێتەوە شەریفە ئاغا دەبێتە خاوەنی مەرو ماڵاتو رەشماڵ ، زۆر جار شەریفە ئاغا لە جیاتی رەشماڵ خیوەتی سپی هەلداوە . .

### شەریفە ئاغاو جەنگی جیهانی یەکەم

شەریفە ئاغا لە ساڵی ١٩١٧ دا کە پیاوی (ئەحمەد خانی)[٣] هەرکی دەبێت لە کوێستانی (خاتوون خاس) لەگەل سەربازانی تورك وەك مەجید چاوەشو ئەحموی هەرکیو چەند سەربازێکی تر هێرش دەباتە سەر سەنگەری رووسەکانی قەیسەری لەم هێرشە تەنیا شەریفە ئاغا رزگاری دەبێت .

### شەریفە ئاغاو جەنگی جیهانی دووەم

شەریفە ئاغا لە سالی ١٩٤١ دا کە پیاوی نورۆی قورشید ئاغا دەبێت لە کوێستانی (وارمامز) هێرش دەباتە سەر (پۆست)ی[٤] عەجەمەکان لە چەند کەسێکی دی لە خێڵی هەرکی ، چەند سەربازێکی عەجەم دەکوژنو ئەوانی دی بەدیل دەگرن ، شەریفە ئاغا لەو شەرەدا بە دەمانجەی (بەرابێل) سەربازێکی عەجەم دەکوژێو تفەنگێکی برنۆی دەستدەکەوێو دەگەرێتەوە بو ناو هۆبەکەی .

## شەریفە شەرۆی لاوك بێژ

شەریفە شەرۆ هونەرمەندێکی بە تواناو دڵ تەربوە ، لاوکەکانی شەرۆ رەنگدانەوەیەکی ژیانی کوچەرایەتیو دڵداریو سوار چاکی کوردی بە دیار دەدات .

دەنگو ئاوازو هەستی ناسكو بەهرەی شەرۆ لە ناو سازو ئاوازی کوردیدا مۆرکێکی تایبەتیو رەسەنایەتێکی تەواوی کوردەواری پیوە دیارە چونکە لە نیۆ کومەلگای کوردەواری هەلقولاوە . لاوکەکانی دەنگو بۆنی هەورازو نشێوی چیایە سەر کەشەکانی کوردستانی لێ دێ .

ئەو لاوکانەی شەریفە شەرۆ گووتیەتی هونەرمەندانی تری کوردیش گووتیانە بەلام هەر یەکە دەنگو ئاوازو گووتنی تامو چێژەی خۆی هەیە .

شەریفە شەرۆ زوربەی ژیانی خۆی لە دیوەخانەی ئاغاو میرو سەروك خێلەکان بردوتە سەر ، شەوان دیوەخانەی گەرم کردوە بە ئاوازو دەنگە زوڵالەکەی .

هەروەها شەریفە شەرۆ لەگەل هونەرمەندانی ئەوسای کورد لاوکی گووتوە لە چایخانەی (عەلی فلەییح) لە هەولێر .

### نموونەیەك لە لاوکەکانی شەریفە ئاغای نەمر

### – یار بەیازێ[٥] –

دەردۆ دەردۆ هەویا گوندێ مەبلندە لە هێوارێ ، بەری خۆ بکەنە شین دۆستا من راوستایە لە هەیوانێ دکات بەنێ ساقێ گولا گۆرێ ئەمن دەچم شین دۆستا خو بخازم ئەگەر دامن چاکو چێتر ، ئەگەر نەدامن ئەزێ دێ برەوینم حوکمێ کوچك چاپێ دەستێ زۆردارێ .

وەرە وەرە یار بە یازی بە ژن بلندێ جاو بەلەکێ سووکا مالێ گەردەن قازێ . دەردۆ دەردۆ بە یازی تەلە شیوازێ[٦] ئەز لە شیوازێ ئەزی بە ژنا دۆستا خۆ پیوا بە بوستێ تەمام گازێ . .

ئەزێ دێ چم شین دۆستا خۆ بخازم ئەگەر دامن چاکو چێتر ، ئەگە نەدامن ئەزێ برەوینم بەمە مالا (بەحری بەگێ) سوار قەوازێ[٧] .

بەلێ حەیفا من دەمینێ پیسە مێری تەرەسی بەرتە رازێ .

وەرە وەرە یار بە یازی بە ژن بلندێ چاو بەلەکێ سووکا مالێ قوماربازێ[٨] .

### سەرچاوەکان

١ – سنتان في كردستان . الجزء الثاني . تأليف دبليو ، ار – هي ترجمة فواد جميل .
٢ – مەجید ئەحمەد خان هەرکی .
٣ – مەجید نورۆ ئاغا هەرکی .
٤ – ئەنا خواجە هەرکی .

### فەرهەنگوك

١ – **مامۆندیان : گوندێکە لە نزیك کەلەکی یاسین ئاغا .**
٢ – **سەید طه النهري : فەرمانرەوای رەواندوز بووە لە سالی ١٩٢٣ تا سالی ١٩٢٩ .**
٣ – **خاتوون خاس ، وارمامز : دوو کوێستانن لە کوردستانی ئیران**
٤ – **پۆست : مەخفەری سەر سنوور .**
٥ – **بەیاز : سپی ووشەیەکی تورکیە .**
٦ – **شیواز : گوندێکە لە کوردستانی ئیران .**
٧ – **قەواز : ناوی ئەسپێ بەحری بەگیە .**
٨ – **قومارباز : حەنەك . یاری .**

# شکارتەیەك لەناو هەریزەجاری میژووی شاری سلیمانی دا

غفور میرزا کریم

بواری میژووی تەمەن کورتی دوو سەد ساڵەی شاری ... دا بەسەرهاتی چرو پرو زەبەندو دڵتەزێن ، قەوماوی ... گێری پر لەنەهاتو شکستەیی ، رووداوی پر لە ئاهەنگی ... خۆیی‌و ئازادی ، چەژنانی پر لە هیواو سەرکەوتن‌و شادی ... بەزەقی‌و گەورەیی‌و روونی دێتە بەرچاو ، کە بێ‌گومان ... ناتوانێ لەئاستی‌دا رانەچلەکێ ، وەلە بێناوی لێکدانەوەو ... کردنەوەو هەلسەنگاندنی دەستەوەستان بوەستێ‌و ... چەکۆنەی تیژی کۆشش بەکار نەهێنێ . . .

... شکراو روونە کە کارەساتی گرنگ‌و مەزن لە رووداوی ... ئالۆز دەوری تایبەتی‌و بالاو کاریگەر ئەکاتە سەر کۆمەڵ‌و ... دەکانی و هەمیشە شوێنەوارەکانی لەسەر هەموو مەیدانە ... وجۆرەکانی دا بەقووڵی بەجێ‌ئەهێلی‌و مۆرك نیشانەی ... یەتی‌و دیاری‌کراوی پێوەئەنێ تاکارەسات چرو پرو قووڵترو ... یگەر تربێ ، یا باری گوزەرانی ژیانی کۆمەڵانی خەلکی ... سەختو ئالۆزترو تەنگوچەلەمەتربێ ، بێ‌گومان شوێنەوارەکانیشی ... یگەرو ریشە داکوتراوترو زەق‌ترو دێتە بەرچاو .

... ئەم سەرزەمینە پان‌وبەرینەدا شاری زۆرکۆن‌و دێرین‌و وە ... شەی میژوویی هاتۆتە سەرشانۆی ژیان . بەرگی گەورەیی‌و دەستەلات‌داری پۆشیوە . هاوبەشی لە کاروانی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی‌دا کردوە . بەلام لەبەرئەمەی سوێرو تالی رۆژگارو ... حوی نائومێدی‌و نەهاتی بەخەرمان نەنۆشیوە . هەنگوینی سەرکەوتن‌و بەختیاری بەدڵ نەچێشتبوو . لە بۆتەی کوێرەوەری ... ندا نەسووتاوە لە چەژنی سەرکەوتن‌و بەهاری شادی دا ... ژیاوەو . کلاقەی ژیاننامەی شیوەیەکی ئاسایی‌و سادەیی وەرگرتوەو لاپەرە میژوویەکانی بێ‌گەردو بێ‌گۆیەندە بەواتایەکی تر . . ناوی لەناو نەبوان‌دا دائەنرێت . . . بە پێچەوانەوە هەندێ شاری تر بێ‌چاوپۆشین لە تەمەنی ندبەسەرهاتی گرنگ‌و مەزن‌و وەچەرخاندنی بنەرەتی میژوویی سەرتاپا مەیدانەکانی ژیانی هێناوەتە لەرزە . بنچینەی دارو دیواری بەسەریەکدا تێك‌وپێکداوەو وێنەو روخساری بێ‌گەردی شێلاوەو ژاکاندوەو بۆیە ناوی لەنەبوونەوە گەیشتۆتە ناو کەشکەلانی فەلەك‌و لەهیچەوە نازناوی شاری مەزن‌و گرنگی براوە بەبالای‌دا وەبۆتە جێگای پر شانازی گەلەکەی وبگرە گەلانی تریش .

بارودۆخی گونجاوی میرنشینی (بەبە) هەلومەرجێکی تایبەتی‌و زەمینەیەکی برشتی بۆ تێ‌کۆشان لە بێناوی بەرفراوانی دەستەلات‌داری‌و بەرەوپێش‌چوون‌و جێ‌گیربوون‌و بەهێزبوونی ئەم قەلای هیواو ئومێدەی کوردەواریە رەخسان‌و خۆش‌کرد ، کە لە ئەنجامدا خولیای‌گواستنەوەی پایتەختی ئەم میرنشینەی لە قەلاچوالانەوە بۆ سلێمانی خستە مێشکی‌و دەماخ رووناك‌و بیرتیژو شارستانی پەروەری ئیبراهیم پاشاوە ، بەمانایەکی تر کۆشش بۆمانەوەو بەهێزبوون‌و پتەوکردنی میرنشینی بەبە ، فراوان‌کردنی ئاسۆی هیواو ئومێدی گەلی کورد بەرامبەر ئەم دەستەلات‌داریە نیشتمانیە . برەودان بەتێ‌کۆشان بۆ خۆراگرتن لە نێوان بەرداشتی دەست‌درێژی‌و چاوچنۆکی دەولەتی عوسمانی‌و دەولەتی ئێران‌دا . کانیاوی بلیمەتی‌و دلۆزی ئیبراهیم پاشای تەقانەوەو بۆ رەنگ‌رشتنی بناغەی شاری سلێمانی خستیە ناو کۆری کۆشش‌و تەقەکەلاوە .

میژووی بنچینەی دانای شاری سلێمانی هەرچەندە بەچەند ساڵێ پێش بەرپابوونی شۆرشی گەورەی فەرەنسە ئەکەوێ (١٧٨٩) ئەو شۆرشەی کە دەرگای مەزنی بۆ شۆرش‌و وریابوونەوەی نەتەوایەتی هاوچەرخ لە جیهاندا کردەوە . بەلام لەگەڵ ئەمەشدا سەرچاوەی بیرکردنەوەو بۆچوونی ئیبراهیم پاشا . وەنەخشەکێشانی بۆ دامەزراندنی شار بۆ هۆش‌وگیانی نەتەوایەتی هاوچەرخ ئەگەرێتەوە شیاوی باسە لە روانگەی زانیاری نوێوە . سەرچامەی بیری نەتەوایەتی هاوچەرخ بۆ شۆرشی کرومویل (١٥٩٩ ١٦٥٨) بوو مەگناکارتەی ئەنگلیزی . بەواتایەکی دیاری‌کراوتر بوو بەسەرەتای بەرپابوونی شۆرشی

پیشەسازی (١٧٥٠ ١٨٥٠) ، چەکەرە هەلدانی چینی سەرمایەداری لە ئەوروپا ئەگەڕێتەوە بۆیە ئەتوانین بلێن کە پێویستی رۆژگارو خواستی مێژوو بیری نەتەوایەتی هاوچەرخ دەوری بالاو بنەرەتی راستەوخۆ لە بنچینەدانانی شاری هاوچەرخ (شاری سلێمانی)دا ، گێراوەو نواندوە .

بەم چەشنە کۆمەڵانی خەلکی بە هەموو بەشە جیاکانیەوە شانبەشانی بەرەی کاربەدەستانی میری بەرابەری ئیبراهیم پاشا کەمەری کۆششیان لێ بەست وەلەمەلکەندی لە تەنیشت ئەوسەرایەی کە محمود پاشا دروستیکردبوو ، دەستیان بەدامەزراندنی مزگەوت ، گەرماو بازارو خانووبەرەو تێکرا بۆیستیەکانی کۆمەلایەتی چاوگەی زانستی شارستانیەتیو بنکەی پیشەسازی کرد ، وەهەموو تواناى لەبن نەهاتوویان بۆ ئاوەدان کردنەوەو جوانکردنو پەرەپێدانی شار خستەگەڕو ئەرکی سەرشانیان لە ئاستی شاری کۆرپەی کوردەواریدا بە جوانیو پیرۆز بەجێ هێنا .

ئیبراهیم پاشا بەپێی نەخشەی دانراوی هەوەڵکۆ دەستی بە بنچینەدانانی مزگەوتی گەورە کرد ، وەدەستو برد فەرمانی بۆ گواستنەوەی کتێبخانە گەورەکەی قەلاچوالان بۆ ئەم مزگەوتەو انانی زاناو داناو شێخ مارف نۆدێیی بۆ دەرس وتنەوەو بەرێوەبردنی کاروباری ئاینیی تیایا دەرکرد بەم چەشنە لەهەموولایەکی کوردوسنانەوە بەکاوخۆوە بازرگان پیاوانی ئاینیی ، پێشەسازان بۆ ئاوەدانکردنەوەو بەجێهێنانی کاروباری کۆمەلایەتی ، زانستیو ، بەرەوێش چوونی وولات بۆ نیشتەجێیبوون بەرەو سلێمانی هاتن ، بەم رەنگە شارێکی گرنگ لە چەرخی وریابوونەوەی نەتەوایەتیو وەتاقی بەهێزیو دەستەلاتداری بەرفراوانی میرنشینی (بەبە) ، بەشانوو بازووی رۆلەی کوردو کۆششی بەپێزی تێکرا کۆمەلانی خەلکی بەرابەری ئیبراهیم پاشای مەزن چاوی لە بێشکەی کێوو کەژەکانی کوردوستان لە مەلبەندی مێژوویی باوپاپیری لولویان ، زامویان دا لە ناوچەی شارەزووری دێرین دا هەلهێناوە وەکو کۆرپەیەکن نازدار هاتە رێزی خەباتی وئاوەدانکردنەوەو شارستانیەتو زانستیەوە وەبەوێنەی پێشەنگێکی لێهاتووی شارو دێهاتەکانی . . . کوردوستان کەوتە هەنگاونان وەبۆ بەرەوپێش چوونو رێچکە شکاندنی سەرکەوتن دەستی بە تەکاندا کرد .

لە بێشەلانی شارە خنجیلانەکەی ئیبراهیم پاشاو ئاوو هەوای سازگارو شیرین سەدەها شۆرە سواری زاناو داناو پێشەوای ئاینپەروەری ، وە رابەری کۆمەلایەتی ، کەڵە شاعیرو پاڵەوانی نیشتمانی پێگەیاندوەو خستووتەوە بە شیبری نیشتمان پەروەریو ئازایەتیو لێهاتوویی گۆشی کردونو پەروەردەی کردونەوە تاجی گەورەیی ناوەتە سەرسەریان وەلەسەر تەختی پایەبلندی داناونو ناویانی بە نەمری هێشتۆتەوە بوونەتە جێگای پڕ شانازیو مایەی بەرزی بۆ رۆلەکانی ئەمرۆو نەوەی دووا رۆژ .

لەسایەی دەستەلاتداری میزشینی (بەبەدا) ، سلێمانی لە مەیدانی ئابووری بەتایبەتی لە رووی بازرگانیەوە لە بەهاری گەشەکردنو چالاکی بێوێنەدا ئەژیا ، باروو دۆخی تایبەتی میرنشینەکەو هەلکەوتنی شار لە دووریانێکی بێهاوتای گرنگو ئیستراتیجی دیاریکراو . . . چاوتێبرینو پەلهاویشتنی دەوڵەتە سەرمایەدارەکان بۆسەر وولاتانی رۆژهەلاتی ناوەراست وچاوچنۆکیو هەلپەیان بۆ دۆزینەوەی بازار بۆکرینی کەرەسەی خاوی هەندانەوە فرۆشتنی کەلوپەلی کارخانەکانیانو . . . جێپێ قایم کردنیان لە ناوچەکەدا ئەم کۆمەڵە دیاردەو چالاکیانە بە تێکراو وێنەو نیگاری لە مەلبەندی سلێمانیدا بەروونیو زەق ئەبیزاو ئەهاتە پێش چاو .

سلێمانی لەم رۆژگارەدا وەکو بنکەیەکی بازرگانیو دوو ریانێکی گرنگی گۆرینەوەی کەلوپەلی پردی هاتوو چۆکەری نێوان شارە ناودارە گەورەکانی ناوچەکە ئەهاتە بەرچاوو ئەناسرا کاروانی سلێمانی هەمێشە بەرێکو پێکی لە هاتووچۆکردندابوو بۆ هەمەدانو تەبرێزو سنە . . . بەغداو کەرکوکو موسل . . . بەهۆی ئەم رێگایانەوە بەرووبومی کوردوستان لە پێستەو خوریو کەتیرەو مازوو ئەگەیشتە روسیاو ئەوروپا وەکەلپەلی ئەم ولاتانەش ئەگەیشتە کوردوستانو ئالوگۆر ئەکرا ، کە شوێنەواری ئەم بازرگانیەش ئەمرۆش لەوێنەی سندوقی هەشترخانی روسی ، سەماوەری وارشۆی پۆلەندیو فەخفوری چینیو قاپوقاچاغی عەجەم لە گەنجینەدا لە مالی بوەی شاردا ئەبینین کە بێگومان ئەتوانین ئەم دیاردانە بەبەلگەی نەویستو نیشانەی رۆشن بۆ دەوری گرنگی شار لە مەیدانی بازرگانیدا دابنێین . بەم چەشنە ئیبراهیم پاشا وەکو بنچینەدانەری شاری سلێمانی کەڵە پیاوێکی کورد ، شارستانی پەروەرێکی بەناوبانگ ، ئاوەدانکەرەوەیەکی ناودارو دامەزرێنەری پایەتەختی میرنشینی (بەبە) چوونە لاپەرەکانی مێژووی کوردەوە کە ئەمرۆ پێویستە لەسەر رۆلەکانیو جولانەوەی رۆشنبیری کورد سەری رێز لە ئاستی گەورەییو کۆششیا دابنەوێنی وەشکۆمەندانە ناوی لەرێزی

ـسکەندەری مەکدۆنی و ئەبوجەعفەر مەنسوورو پەترسی گەورەر
ـ ـیْ کە ناویان لە مێژووی جیهاندا بەدامەزرێنەری شاری
ـسکەندەریەی میسری و بەغدادو پترسبورغ ناسراوەو
ـەرچووە .

مەگەر بەم هۆنراوە بەنرخەی خوارەوەی شاعیری بەناوبانگی
ـورد شێخ رەزای تاڵەبانی بتوانین کەمێ باروو دۆخی گەش و
ـێەو روخساری قەشەنگی ئەو چەرخە پر لە سەرکەوتن و
ـەستکەوتە گەورەیە بپێوین و بینرخێنین ، وەوێنەی بێگەردی
ـەری سلێمانی لە تاڤی دوو بەهاری پێشکەوتن و سەربەخۆیی
هەرەتی شاسواری ، پەرەسەندنی مەزنیدا پیێبکێشین .

ـە بیرم دێ سلێمانی کە دارو ملکی بابان بوو
ـە مەحکومی عەجەم ، نەسوخرەکێشی ئەهلی عوسمان بوو

* * * *

ـەبەر قاپی سەرا سەفیان دەبەست شێخ و مەلاو زاهید
مەطافی کەعبە بۆئەربابی حاجەت گردی سەیوان بوو

* * * *

ـەبەر تابووری عەسکەر رێ نەبوو بۆ مەجلسی پاشا
صەدای مۆسیقاو نەقارە تا ئەیوانی کەیوان بوو

* * * *

درێغ بۆ ئەو زەمانە ، ئەو دەمە ، ئەو عەسرە ، ئەو رۆژە
کە مەیدانی چریت بازی لە دەوری کانێسکان بوو

* * * *

بە زەربی حەمەیلە بەغدادی تەسخیرکردو تیّی هەڵدا
سلێمانی زەمان راستت دەوێ ، باوکی سلێمان بوو

* * * *

عەرەب ئینکاری فەظلی ئێوە ناکەم ئەفظەلن
ئەمە سەلامەدینێ کە دنیای گرت ، لە زومرەی کوردی بابان بوو

* * * *

قوبووری پر لە نوری ئەهلی بابان پر لەرەحمەت بێ
کە بارانی کەفی احسانیان وەك هەوری نیسان بوو .

* * * * *

کە عبدالله پاشا لەشکری والّی سنەی شر کرد
رەزا ئەو وەختە پێنج و شەش طفلی دەبستان بوو .

# کەرەکوان

تۆمارکردنی عباس عبدالله یوسف

کەرەکوانۆ لە کەرەکێ .
مارتی وەبدا بە بەرەکێ .
لۆم دەربازکە چاو بەرەکێ .

—

کەرەکوانۆ لە قەندیلی .
دەس مەزرەفەت هێسکێ فیلی .
مارت وەدا بە بنی پیلی .
لۆم دەربازکەپەکەفیلی .

— —

کەرەکوانۆ لە قەسرۆکێ .
کلم هێنا پەدەسرۆکێ .
لۆچاوینە خەجیجۆکێ .

کەرەکوانۆ لەبرێ ساوا .
لێت تاری بن هەردووچاوا .
لۆم دەربازکە لانکێ ساوا .

— —

کاولو وێران چەند بە بێ‌یە .
لێیان بگرن پەسووکی‌یە .
دەرباز ناکەن چاوٚك سیی‌یە .

— —

کاولو وێران چەند بە بەردە .
لێیان بگرن شوٚو وەردە .
دەرباز ناکەن خمزێم زەردە .

— —

کەرەکوانۆ زێ‌وەزێ‌دا .
هەنجیرۆکابن تاوێ دا .
بە پاییزێ شختێ لێدا .
کیژالیفە وکور پاروێدا .

— —

کەرەکوانۆ هەمیاینە .
هەرچی جوان بێ وەی پەرینە .
هەرچی پیر بێ بیخنکینە .

کەرەکوانۆ حمەرۆکا .
دەسکێ بێرێت کەرەنۆکا .
لۆم دەربازکەیا کچکۆکا .

### تێبینی

ئەم تێکستە فولکلوري = لە گوندی (جۆنەلە)ی سەر بە ناحیەی خەلیفان تۆمارکراوە .

### فەرهەنگۆك

کەرەکوان = خاوەنی کەلەك ، کەلەکوان ، جازان کەلەك لە مەشکە کەلەکي وکوندەی پفکراو دروستدەکرا وخەلکیان پێ‌دەپەڕاندەوە لەزێ‌دا .

کەرەکێ = یاسین ئاغا . لە نێوان هەولێر وموسل .

بەرەك = بەلەك .

بەرەك = بەلَەك (چاوی رەش‌و سپي) .

قەندیل‌و قەسرۆك = ناوی دووگوندن سەر بە ناحیەی (حەریر)ن .

دەس‌مەزرەفە = سەول .

دەسرۆك = دەستەسر ، دەسماڵ .

پە = بە .

خەجیجوك = ناوی ئافرەتێکە .

ساوا = گوندە سەر بە ناحیەی خەلیفانە .

بڕ = تەنکاو ، بوار .

تاری‌بن = کوێرین ، تاریك‌بن .

زێ‌وە زێ‌دا = رۆشیتن زێ‌و زێ . روبارو روبار .

بن تاوێ‌دا = بن لە ئاو . رەگ لە ئاو .

شختێ لێ‌دا = سرماو سڕەی پایز وشکی کرد .

هەمیا = گشتیان .

حمەرۆك = ناوی‌کەسێکە .

بێر = بێڵ .

کەرەنۆك = لاسکەنۆك = کەلەنۆك .

## فۆلکلۆری کوردی

# ڕووداو . . و . . گۆڕانکاری لە نێو ساڵنامەی کوردیدا

ئامادەو کۆکردنەوەی :
ڕۆستەم باجەلان

هەر لە دێر زەمانەوە کورد لە ناوچەیێکی شاخاوی ژیاوەو نیشتەجێ بووە ، دوای ئەنجامو تاقیکردنەوێکی زۆریش سوودێکی زۆری لە ڕووداوەکانی سروشتی دەوروبەری خۆی وەرگرتووە ، بەپێی ئەم ڕووداوانەیش توانیوێتی پسپۆڕانە چەند ڕووداو . . و . . گۆڕانکارێك لەنێو ساڵنامەی کوردیدا بدۆزێتەوەو بیخاتە ناو قاڵبی قسەی نەستەقو شیعرەوە . ئەمانەی خوارەوەش تابلۆێکی لەم ڕووداو . .و . . گۆڕانکاریانە :-

١ - ڕەشەمە ڕەشو تووشە
نە(کا)ماوە نەپووشە
کەران هەر لووشە ،لووشە
٢ - ڕەشەمێ ڕەشە میان
دەغڵ بڕاوە لە کەندووان
بەشەر دێنێ بووکو خەسووان
٣ - ڕەشەمە ڕەشکی ڕووان
بەتار دەکا چارو کەندووان
بەشەر دینی بووکو خەسووان
ڕۆژ دەبێتە سار (١)
نان دەبێتە نار (٢)
زگ دەبیتە جوار (٣)

٤ - ڕەشەمەو ئادار
دوونە دەبنە چار
زگ دەبیتە جوار
پیاو دەبیتە بەقار (٤)
کان دەبیتە عەبدار (٥)
نان دەبێتە نار
٥ - لە حەفدەو هەژدەی ئاداری
مەلەك دێتە خواری
دەنگ دەکا لە بوهاری
بەفر دەکەوێ هەتا گوێی داری
نامینێ هەتا ئێواری
٦ - مانگی ئاداری

بەفر دەباری
هەتا گلۆێکی داری
نامێنێ هەتا ئێواری
٧ - مێردەم دەبێنێ
ئۆغەن دەشکێنێ
٨ - ئادار ناچێتن بەبێ دۆ
نیسان ناچێتن بەبێ جۆ
٩ - هاوینە
دارو بەردی زێڕینە
١٠ - ڕوون بڕا لە کوزی
چارە نی یە بەبوزی
١١ - ڕۆژی لات

هەمو ورات [٦]

١٢ – پیت

لە خوێ ڕیت

١٣ – بیستویەك كەرەی گۆرانی

كەری بردە سەر كانی

كورتانی هیناوە بەشانی

١٤ – هەور ڕوێی (لۆ) [٧] بادینان

خوێد (هەركوتە) [٨] لۆ كادینان

١٥ – هەور ڕوێی لۆ بادینان

لاقان (هەركەن) [٩] لۆ كادنیان

١٦ – هەور ڕوێی لۆ بادینان

سوێران چوونە ناو كادینان

١٧ – هەور ڕوێی لۆ شارەزور

كاروان برۆ لۆ ڕیگەیدوور

١٨ – پیتو پالۆز

سالْ بوو ئالۆز

١٩ – خدرە یلاس

سالْ خەلاس

(١) – تێبینی : بۆ دانانی ئەم تابلۆیە سوود لە زۆربەی ناوچەكانی كوردستان وەرگیراوە .

٢ – فەرهەنگۆكە :

١ – سار : سالْ

٢ – نار : نالْ

٣ – جوار : جوالْ

٤ – بەقار : بەقالْ

٥ – عەبدار : عەبدالْ

٦ – ورات : وڵات

٧ – لۆ : بۆ

٨ – هەركوتە : هەڵكوتە

٩ – هەركەن : هەڵكەن

# سەربەخۆ بوونی دەروونناسی

سایكۆلۆژیا : ئەم زاراوەیە لەكوردیدا بە مانای دەروون ناسی یان دەروونزانی دێت . مانای پڕاو پڕی ئەوە ، لە لێكۆلینەوە بەدواگەڕاندا . لەناوەڕۆكدا ، بەمانای (لێكۆلینەوە لە ناوەوەو هۆشو ئەو گۆڕانانەی بەسەر ناخی مرۆڤدا دێت . هەروا ئەو كارلێكەرانەی كار لە هەستو هۆشی مرۆڤ دەكەن لەلای ئینگلیزەكان ئەم دارشتنەی Psychology هەیە لەلای یۆنانییەكان ووشەی (یوخی) بەكاردەهێنرێ بە مانای (ئەو هەوایەی هەڵی دەكێشین) لەرووی بەكارهێنانەوە ووشەی سایكۆلۆژیا لەلایەن گۆكلینوین . لەساڵی ١٥٩٠دا بەكارهێنرا بۆ ناونیشانی یەكێك لە كتێبەكانی ، هەروا مالنكتونیش بەكاری هێنا . بەلاّم باشترین بەكارهێنان لە سەدەی هەژدەم بوو . لەلایەن (كرستبیان ڤولڤ) بە ناوی (سایكۆلۆژیای ئەمبیریكا) لە ساڵی ١٧٣٢ (سایكۆلۆژیای راسیونالس) لە ساڵی ١٧٣٤ پاش ئەوە فەیلەسوف (كانت) دەستی پێوە گرتو بەشێوەیەكی چاك بلاّوبووەوە ، بەتایبەتی لە لایەن مینێدیبیران و هاربەرت كە هەوڵی گەورەیاندا . سایكۆلۆژی لە فەلسەفە جیابكەنەوە وەكو بەشێك لە زانستە سروشتییەكان لیێ بكۆلرێتەوە ، شتێكی ئاشكرایە هەر لەسەردەمی ئەفلاتوون و ئەرستۆوە پێش ئەوانیش . تا دەگاتە دانانی لابووری لابیزگ لە سەردەستی ڤۆنت لە ساڵی ١٨٧٩ .

توێژەرەكان لە ڕوانگەیەكی فەلسەفییەوە بۆ دەروون ناسی دەچوون و لیێان دەكۆلییەوە لەوسەردەمە هیچ فەیلەسوفێك نەبووە دەستی بۆ درێژ نەكات . هەوڵدانی زانایان لە سەدەی نۆزدەم ئەوەبوو . دەروونناسی لە فەلسەفەوە دابرێتو گۆڕەپانو زاراوەی تایبەتیو بۆچوونی خۆی هەبێتو لە میتافیزیكو تەرمایی (وهم) جیای بكەنەوە كاتێ كە تەماشای دەروونناسی دەكەین دەبینین لە نێو كۆشی فەلسەفەدا بووە . ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كەوا ئەم زانستە لە كۆتایی سەدەی نۆزدەم گەشەی كردووە (١٨٧٩) بەشێوەیەكی سەربەخۆ پێشتر چەندەها فەیلەسوف لیێ كۆلیونەتەوە هەروەكو لە سەرەوە ناومان هێنان .

ئامادە کردنی : موحسینی ئەحمەد عومەر

جالەم بارەیەوە دیکارت و هۆبزیش بە لێکۆڵەرەوە دادەنرێن ـە سەرەتای سەدەی هەڤدەهەم گالیلۆو چەندانی تر لە ـیریکی یەکان شۆرشێکیان هەڵ گیرسان لەبارەی سروشتی یە ـکەوە (طبیعیات) بە پیشاندانی گەلێك لەکارەکانیان لە ژێر حوولەو بارئەگۆرین هەروەها هارخی – کارە فزیۆلۆژی یەکانی ـەزراوەی فیزیکی لێك دەداوە کاتێ کە سووڕانی خوێنی ـۆزی یەوە دیکارتیش هەوڵی ئەوەی دەدا سروشتی یەکان ـقی بکاتەوە لە سەر پیێزانینی رەوشتی گیانەوەر ومرۆڤ دیکارت سروشتی لە سەر (کاری دانەوە) لێکدەداوە . لەلای دیکارت (کاری دانەوە) ئەوەیە : شلەیەکی دیاری کراو لە دەمارەوە (واتەمێشك) دەست بە بزوتن دەکات . بۆ ئەندامەکانی هەست و ئینجا بۆ مێشك جارێکی تر بۆ ماسولکەکان . واتە ئەو بزاڤتنە کە ئەندامەکانی هەستی ئاگادارکردەوە لە نێو لەشدا پرۆسیسێکی فیزیکی پێك هێنا ، بەجوولەی ماسولکەیی کۆتایی دێت بەڵام ئەلایەنی روح و ئەقلەوە دیکارت مرۆڤ لە گیانەوەر جیادەکاتەوە بەوەی مرۆڤ بیر دەکاتەوەو ئەقلی هەیە هەروا شوێنی روح یان گیان لەلای دیکارت مێشکە بەڵام دیکارت وادەبینێ کە گیانە وەر لە بەرئەوەی ئەقلی نی یە بە ئامێرێکی میکانیکی دادەنێت . بۆ مەسەلەی روحیش وەك لێکدانەوەیەکی فەلسەفی ئەو روانینێکی ئایدیالیزمانەی هەیە کەوتۆتە نێو کێشەی دوانەکی بەڵام هۆبز لە دیکارت زیاتر رۆیشت لەلای هۆبز پرۆسیسە ئەقلی یەکان هەروەکو پرۆسیسەکانی لەش وایە واتە جوولەی دەرەکی رادەوەستێتە سەر ئەندامەکانی هەست و بە مێشك و دڵ دەگات جوولەی ناوەوەش بە هۆی چەند شتێکی خودی یەوە بەردەوام دەبێت لە شێوەی بیرو بیرەوەری . بەم شێوەیە پرۆسیسە ئەقلی یەکان بۆ بنچینەیەکی گشتی جوولەیی لە ریزی پرۆسیسە فیزیکی یەکان رادەوەستێت .

دیکارت و هۆبز . . . رەخنەیان لە دەروونناسی ئاسایی و پێش خۆیان دەگرت . ئەو شتانەی ئەوان دەیان ووت (بەرای هەردووکیان) گۆرانێکە یاخود بریتی یە لە دەروونناسی نوێ فیزیك کارێکی گەورەی کرد .

بەڵام لەهەمان کاتدا زاناکان ویستیان لە کیمیاش سوود وەرگرن . رووداوە دەروونی یەکان لە ژێر کارتێکردن و دۆزینەوە کیمیایی یەکان لێکی دەنەوە دەروونناسی ئەو کاتەش هەر لە شارەزایی ئاگایی و زانستی ئاگایی دەکۆڵی یەوە بەم شێوەیە قوتابخانەی هاوبەندی (الربطیة) دروست بوو لە کۆتایی سەدەی هەژدەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەم بە لێکدانەوەی شارەزایی ئاگایی توانی بگات بە گێرانەوەی بیرگرینگی یەکە لە وەدایە کەوا ئەم قوتابخانەیە دەروونناسی پێشکەوتنخواز بوو لەسەدەی نۆزدەم ، باوەڕ ولێکدانەوەکەی هۆبزیان رەتکردەوە . هەوڵی ئەوەیان دەدا ، دەروونناسی هەمووی بگێرنەوە بۆ پرۆسیسی (هاوبەند) ئەم گێرانەوەیە کە هاوبەندی یەکان خۆیان پێوەبەستبوە وە لە راستیدا ، دانانە سەرەتایی یەکەی دەگەرێتەوە بۆ ئەرستۆ . بەڵام هاوبەندی یەکان تاقی کردنەوەو گۆرانیان بەسەردا هێنا تاکو کردیان بە قوتابخانەیەکی تەواو . ئەمە درێژەی کێشا تاکو هاوبەندی یەکان بەسەر دەروون ناسی سەدەی نۆزدەم زاڵ بوون ، هەرچەندە جیاوازی یان لە نێو دابوو لە مەر مەسەلە فیزیکی و کیمیایی یەکان .

سایکۆلۆژیای سەدەی نۆزدەم : سەرەتا ووتمان ووشەی (سایکۆلۆژیا) لەلای کانتدا تارادەیەك ، دەستی پێوەگیراو جیّی خۆی گرت . بەڵام کانت هیچ کارێکی وای نەکرد دەروونناسی وەکو زانستێکی سروشتی بێتەکایەوەو سەربەخۆ بێ و لە فەلسەفە ، ئەمە بە تەواوی لە هەردوو کتێبەکەی دەردەکەوێت (رەخنەلەئەقلی پاك) و (رەخنە لە ئەقلی کاریدا) کە هەردووکیان یەك بە دوای یەك لە ساڵی ١٧٨١ و ١٧٨٨ بڵاو بووەتەوە کانت کارێکی سەلبی هەبوو لەم رووەوە ویست و رەوشتی چۆن لێك دەداوە بەهەمان شێوە پیێزانین هەستی تێگەیشتی لێك دەداوە ئەوکارانەی کانت لی ی دەکۆڵی یەوە بەسترابیوەوە بەفرمانی رەها . دەروونناسی هان نەدەدا تاکو بکۆڵێتەوە لە ئارەزوو ویست و ویژدان . لە ساڵی ١٨١٦دا کتێبێك لەلایەن هێربارتەوە دەرچوو ئەم کتێبە تام و رەنگێکی تری هەبوو زیاتر بەرەو دەروون ناسی دەچوو وەکو خۆی ، واتە وەکو زانستێکی سەربەخۆ . ئەویش کتێبی (فێربوونی دەروونناسی) دوای ئەو کتێبی (دەروونناسی وەکو زانستێك) لە ساڵی ١٨٢٤دا (مین دی بیران لەساڵی ١٨١٢دا کتێبێکی بڵاوکردەوە لەژێر ناوی ( گوتارێك دەربارەی بنچینەی دەروونناسی) بەڵام ئەو کتێبە هەروەکو لە ناونیشانەکەی دیارە زیاتر نەرۆیشت .

پیشاندانێکی رەخنەیی بوو بۆ سەر بەهانە بنچینەیی یەکانی دەروونناسی . بێ ئەوەی چارەسەری دەروون ناسی بکات وەکو خۆی کە هەیە کتێبەکانی هێربارت یەکەم سەرچاوەی راستین کە چارەسەری دەروونناسی دەکەن بە شێوەیەکی سەربەخۆ . بەرای هێربارت دەروونناسی بە هەنگاوێك سەربەخۆ لی ی ناکۆڵدێتەوە ، ئەمە لە کتێبی دووەمدا دیارە کە بەناوی

دەروون‌ناسی وەکو زانستێك کە لەسەر شارەزایی‌و میتافیزیکی‌و ماتماتیکەوە دانراوە بەلای کەمی‌یەوە هێربارت پیِ‌ی وایە دەبێ لەو سێ بنچینەی سەرەوە پێویستە تەنیا شارەزایی بهێلرێتەوە تاکو سەر بەخۆیی وەرگرێت .

لەو کاتەشدا گەوهەری دەروون ناسی نوێ کە لەسەر هەڵدان دابوو ، ئەوە بوو لە میتافیزیکا جیابێتە وەوە گرتنی ئاراستەیەکی باو لەزانستە سروشتی‌یەکان)[1]

لەلایەکی ترەوە ئەو کارەی فزیۆلۆژیا کردی‌یە سەر دەروون ناسی لە کاری کیمیا گەورە تر بوو . چونکە فزیۆلۆژیا راستەو خۆ پەیوەندی بە دەروون‌ناسی‌یەوە هەیە ، بە تایبەتی لە رووی (اعصاب) دەمارەوە ئەوەش لەسەر دەستی یوهان مۆللێر گەشەی کرد . لەرووی بایۆلۆژی‌یەوە بە تایبەتی مەسەلەی پەرەسەندن‌و گەشەکردن . رێگای خۆش کرد بۆ لێکۆلینەوە لە بۆماوەو رەوشتی گیانەوەر . مندالێ سێکس ،ئەو کاتە ئەو شتانە لە دەروون‌ناسی زورزۆر نامۆ بوون . جا پێویستە بلێین ئەمانە بریتین لە کارلێکەرەکانی دەرەوە کە دەروون‌ناسی بەخۆیەوە بینی ، لەسەدەی نۆزدەم گەلێك گیروگرفتیان نایەوە تا ئەو کاتەی دەروون‌ناسی لە فەلسەفە دابرا ، بەلام ئەو دابرانە یەکسەر رووی نەدا دەبێ ئەوە بلێین کە زیاتر لەهەزار سالێ فەیلەسوفەکان لە سەر دەروون ناسی‌یان دەنووسی ، هەتا لە سەدەی نۆزدەمیش دا هەبوون هەستی پیِ‌ دەکرا ، بۆ نموونە ڤۆنت و ولیەم‌جیمس ، فەیلەسوف بوون : پاش ئەوەی جیمس کتێبەکەی (باوەرەکانی دەروون‌ناسی) دان ، هەموو توانایەکی خۆی بۆ فەلسەفە تەرخان کرد . تا بە فەیلەسوفێکی پرگماتیزمی ناوی دەرکرد . ئەو کاتە فەیلەسوفەکان دەستێکی بالایان هەبوو . وایان لە دەروون ناسی دەکۆلی‌یەوە ، هەروەکو بەشێك بێت لەو مەبەستە فەلسەفی‌یەی هەیان بوو .

بەلام زانا دەروونی‌یەکان بە تایبەتی تاقی کردنەوەیی‌یەکان .

ئەم بارەیان پەسند نەکرد ، هەولیان دەدا دەروون‌ناسی بە بانگی بارەیان ، هەولیان دەدا دەروون‌ناسی بە بانگی سەربەخۆیی بەهێز بکەن پاش دانانی لابورەکەی ڤۆنت ل سالی ١٨٧٩ سەرکەوتن بە وەرگرتنی هەندێ بەشی تایبەتی لەزانکۆکان . هەر وەکو بلیِ‌یت پێویستیان بە فەلسەفە نەبێت ، ئەمەو تا زیاتر گەشەی کرد پاش ئەوە دەستیان کرد بە پێناسە کردنی سایکۆلۆژی پێش هەموو شتێك ووتیان دەروون‌ناسی بریتی‌ یە لەزانستی هۆش یا هۆشمەندی (لەم رووەوە جیمس دەی گووت دەروون‌ناسی بریتی‌یە لە زانستی ژیانی ئەقلی ،جا ئەمە لە دیاردەکانی دابێت یا لە مەرجەکانی ، دیاردەکان ئەو شتانە دەگرێتەوە کە پیِ‌ی دەلێن هەستەکان . ئارەزووەکان ، زانینەکان‌و بیرکردنەوە ویستەکان ، هتد . . . لە سالی ١٨٩٢ ڤۆنت گووتی . . . دەروون‌ناسی ئەوەیە کە لە تاقی‌کردنەوەکانی ناوەوە بکۆلێتەوە واتە ، هەست‌و ئاگایمان ، بیرکردنەوەو ویستمان بەرامبەر بە تاقی کردنەوەکانی دەرەوە هەندێ جار تەماشای ئاگایی دەکرد کەوا جیهانێکی ناوەوەیەو جیاوازە لە جیهانی سروشت‌و دەرەوە)[2] . رووبەکی تری ئەم باسە ئەوەیە ، فرویدِ سەرەتا بە فزیۆلۆژی خەریك بوو ، ئینجا کاری پزیشکی‌و دوایش چوون بەرەو لێکدانەوەی ناوەوەی مرۆڤ وەکو شی‌کەرەوەیەکی دەروونی . جا دەتوانین بلێین .

فرویدیزم بەردی بناغەی ئەم سەربەخۆ بوونەی چەسپاندوە یا خود گۆرانێکی زۆر گەورد بوو بۆ ئەو هەولە کەمەی کە لە سەرەتاوە درا ، وەکو بەردەوامی‌یەك .

جا لە سەدەی بیستەم ، یەکەم شت بە بیرمان بێ ئەوەیە ئەم زانستە زانستێکی نوێ‌یەو مێژووی لە بارەی دروست بوون‌و پەرەسەندنی بەشێوەیەکی تەواو تازەیە . دەروون‌ناسی بە شێوەیەکی راست‌و دروست لە کۆتایی یەکانی سەدەی نۆزدەم سەری هەلداو جیابۆوە لەگەل ڤۆنت‌و لابورەکەی لە سالی ١٨٧٩دا . هەروەها لە سەرەتای ئەم سەدەیە پەرەی سەندو قوتابخانەی جۆر بە جۆرو روانینی تایبەتی هاتەکایەوە ، واتە لە سالی ١٩٠٠وە دەستی پێکردو کەمێکیش پێش ئەوە . قوتابخانەی گشتالت لە سالی ١٩١٤ لە ئەلەمانیا سەری هەلدا . رەوشتی‌یەتی لە سالی ١٩١٢ لە ئەمەریکا سەری هەلدا (واتسون) . مەبەستی‌یەتی PURPOSIVISM .

ئەم قوتابخانەیە ئینگلیزی‌یە لە سالی ١٩٠٨ سەری هەلدا شی‌کردنەوەی دەروونی (فرویدیزم) نزیکەی سالێ ١٩٠٠ ، هەزوا قوتابخانەی فەرمانیەتی (الوظیفیة) کە ئەمەیان زۆر کۆنەو بە شێوەیەکی باش دیاری نەکراوە ، لە سالی ١٨٩٨دا ئەم ناوەی بەخۆوەگرت . رۆنانەوەیش (البنائیة) لە هەمان سالدا .

قوتابخانەی هاوبەندی (الربطیة) کە خۆی ئینگلیزی‌یەو زور کۆنە لە مەوە بۆمان دەردەکەوێت کەوا پەرەسەندنی دەروون‌ناسی‌و لق لیِ‌ بوونەوەی بە شێوەی رێرەو قوتابخانە بە نێوان سالانی ١٨٩٨و ١٩١٢ دایە .

سەرچاوەکان

١ – علم النفس في مائه عام ، فلوجل . لا ١٦ .

٢ – مذاهب علم النفس . دكتور علم زيعور . لا – ٩٣ .

# هونەری دڵداری

نووسەری :

ئەندری مۆروا

وەرگێڕی :

شاکر فتاح

## دڵداری چی‌یە ؟ . .

**ئایاهونەرە ، یان ، ئارەزوویەکی سورووشتی‌یە ؟**

ئەگەر بمانەوێ وەرامی ئەم پرسە بدەینەوە . پێویستە لە پێشەوە ئەم پرسە لە خۆمان بکەین : هونەر چی‌یە ؟

بەلای (بیکۆن)ەوە وایە : کە «هونەر لە تێکەڵ بوونی مرۆڤ‌و سورشتەوە دورووست بووە» . لەراستیدا لەبابەت (هونەر) ەوە لەمە ڕاستترو ووردتر نەگوتراوە . بۆ وێنە ئێمە لە هونەری وێنە کێشاندا وامان چاوپێ‌دەکەوێ کە سورووشت کەرەستەی خاو بۆ وێنەکە دەخاتەبەردەم وێنەکێشەکە : درەخت وگوڵ‌و زری‌و ڕووناکی‌و ڕووی مرۆڤی پیشان‌دەدات . . . پاش ئەوە وێنەکێشەکەیش دێت ، ئەم کەرەستانە لە شێوەیەکی وادا ڕێك‌دەخات کە کەسانی‌تر چاویان پێ‌بگەشێتەوە مێشکیشیان پێ‌بحەسێتەوە . . لە هونەری چیرۆکیشدا ، دووبارە سورووشتمان وا دێتەپێش‌چاو کە هەچی کەرەستەی چیرۆك هەیە دەیخاتە پێش‌دەم چیرۆك ڕێگ – خەرەکە : تاسەو تەزووو ئارەزووە پڕخرۆشەکان‌و ، ئارەزووە پێچەوانەکان ، تاوانەکانی مرۆڤی پیشان دەدات . . . چیرۆك‌بێژەکەیش هیچی بۆ نامێنێتەوە ئەوە نەبێ . کە ئەم کەرەستەخاوانە تێکەڵ بە یەکتری بکات‌و . لە شێوەی مەرگەساتێکی جەرگبڕدا دایبڕێژێ . کە کار لە دڵ‌و دەروون بکات . .

هەروەها لە (دڵداری)یشدا . کە ئەمیش هونەرێکە لە هونەرەکان : سورووشت کەرەستە خاوەکانی بۆ ئاماەدەکات . مرۆڤ بۆ دەکات بە دوو ڕەگەزەوە : یەکێکیان نێر . یەکێکیان مێ . لە هەردوو ڕەگەزەکەیشدا ئارەزوویەکی سورووشتی دادەمەزرێنێ بۆ پاراستنی ڕەگەزی مرۆڤ . . . پاش ئەوە . هەرچی ماوە بەجێ‌دەهێڵێ بۆ مرۆڤ خۆی ، کە بە ئارەزووی خۆی ئەم کەرەستە خاوانە قاڵ‌و پوختە بکات‌و . بیخاتە شێوەیەکی واوە کە لەگەڵ جێگاو کاتدا ڕێك‌بکەوێ . . . جا ئەگەر هۆشی مرۆڤ ئەم کارەی نەخستایەسەر شانی خۆی ، دڵداری‌ی مرۆڤایەتی هەروەك خۆی دەمایەوە . هیچ پێش‌نەدەکەوت . هەروەك سەرەتاکەی بریتی دەلوو لە کارێکی لنگك‌بازی‌ی ساکار . بە چەشنی ئەو دڵداری‌یەی کە لەناو سەگەکان یاخود بەرازەکاندا هەیە ! . . . ئەگەر لە دڵداری‌ی ناو گیان‌لەبەران ووردبببینەوەو . سەرنجێکیش بدەین لە نامەراست ورەوانەکانی دڵداری‌ی مرۆڤ . ئەوسا تێ‌دەگەین کە لە ناوەند دڵداری‌ی سورووشتی‌و دڵداری‌ی هونەرمەندانەدا چەند جیاوازی هەیە . بە بۆنەی ئەمەوە چیرۆکێکی ناوازە هەیە بام بیگێڕینەوە . دەڵێن : باوکێک چووەتە نووسراوخانەیەکەوە . نووسراوێک بکرێت بۆ کچەکەی . کە پێ‌بگوتبوو بۆی بکرێت . کاتێ کە نووسراوەکەی پەرە پەرە تەماشاکرد . لە نووسراو فرۆشە ئافرەتەکەی پرسی : «تۆ بڵێ‌ی خانم . نووسراوەکە لەبابەت کەینەوبەینەی ڕەگەزبازی‌یەوە نەدوێ ؟» . ئافرەتەکەیش لە شێوەیەکی وادا وەرامی دایەوە کە دەیویست دڵنیای‌بکات . گوتی : «دنە گەورەم لەو بابەتەوە نادوێ ! . . نووسراوەکە بریتی‌یە لە چیرۆکێکی دڵداری ! . . . .» .

### هۆیەکانی دڵداری

جا بۆ ئەمەی لە هونەری دڵداری تێ‌بگەین . پێویستە لەسەرمان وەرامی چەند پرسێکی سەرەتای بدەینەوە

(یەکەمیان) ئەوەیە : کە بۆچي مرۆڤ تەنیا یەك کەسی دیاردي‌کراو هەڵدەبژێرێ‌و هەموو هۆشێکی خۆی دەخاتەسەر ئەوو لەم ڕووەوە بایەخ بە هیچ کەسێکیتر نادات ؟
بۆ ئەم پرسە دوو وەرام هەیە :

(یەکەم) ، ئێمە لە چەند تاوێکی تایبەتي‌ی ژیانماندا – بەتایبەتی لەدەمی هەرزەکاري‌و تەمەنی پەنجاساڵیدا – هەر لەخۆمانەوە ، ئامادەی دڵداري دەبین . . تەنانەت لاوەکە وای لي‌دێ ، ئەگەر بێتو کچێکی دەست‌نەکەوێ خۆشی‌بوێ‌و دڵداري‌ی لەگەڵدا بکات لەناو مێشکی خۆیدا ئەو کچە دوروست‌دەکات ! . کچەکەیش ئەگەر لاوێکی دەست‌نەکەوت گرفتاری تیری ئەڤینی بێ ، پاڵەوانەکانی چیرۆکە هەڵبەستەکانی بەدڵدادەچێ ، یاخود حەز لە ئەستێرەکانی سینەما دەکات ، یان مامۆستاکانی خوێندنگای خۆش‌دەوێ ! . . لەمەیشەوە تێدەگەین ، کە هۆی‌دڵداري «لاوێتي» خۆیەتی کە لە هەموو هۆیەکانی دڵداري بەهێزترە ! . . چونکە لە تافی کورێنی‌دا لەشێ مرۆڤ تینووی نیوەکەی تری خۆی دەبێ . جا لاوێتي‌یەکەیش هانی خاوەنەکەی خۆی دەدات کە بکەوێتە داوی خۆشەویستي‌ی یەکەم کەسێکی (پەسەند)ەوە کە کارەساتی ڕۆژگار بیخاتەبەردەمی ! . . . هۆیەکی تری دڵداري‌یش بریتي‌یە لەو «جێگاورێگا» یەی کە ژن‌و پیاو بۆ یەکەم جار چاویان بە یەکتر دەکەوێ لەناویاندا . . بۆ وێنە ئەوانەی شەرمنن ، بە «ناچاري» دەکەونە ناو جەربەزەیي دڵداری‌یەوە ، وەك ئەوەی کە لە ژمارەیەکی گەورەی ئافرەتە فەرەنسزي‌یەکان قەوما کە لە دەمی شۆڕشدا خرابوونە بەندیخانەوە . ئەو ئافرەتانە لەپێشدا هەموو ژنی داوێن‌پاك بوون . بەڵام کە لە بەندیخانەدا چاویان بە پاڵەوانەکانی شۆڕش کەوت . ئامادەیي‌یان بۆ دڵداري زیندووبووەوە . کەچي لەوەپێش کوژابووەوە . . گەلێك وێنەی جۆی‌جۆرێش هەیە کە ئافرەت کێش‌دەکات بۆ باوەشی پیاو . وەك ناوبانگی پیاوەکە ، یاخود سامانەکەی ، یان هێزو دەسەلاتەکەی ، یاخود وێنەکانی تری سەرکەوتن کە پیاوەکە لە شێوەیەکی شەنگ‌و شۆخ‌و گەشدا دەخەنە پێش‌چاوی ئافرەتەکە ، کە هەموو نەنگي‌و کەم‌و کووڕي‌یەکی پیاوەکە دادەپۆشێ . گەلێ جاری وایش هەیە کە سەرگرتنی جەربەزەیەکی فڕۆکەواني لە ئاسماندا ، یاخود سەرکەوتنی لاسایي کەرەوەیەك لە چیرۆکێکی لاسایي‌کردنەوە ، یاخود هي سینەمادا ، یان دەرچوونی وەرزشکارێك لە گرەوێکی وەرزشدا ، یاخود دەرکەوتنی هونەرمەندي‌ی ووتاربێژێك لە ووتارێکی زرنگ – کاري ، یان وێژەیدا . . . دەبێتە هۆی دەست‌پێ‌کردنی خۆشەویستي‌یەکی گەرم‌و گوڕو تەووژمدار کە هەر بەرهەڵستێکی بێتەڕێ بەسەریدا باز دەدا ! . . .

## خۆشەویستی لە یەکەم چاوپێکەوتنەوە ؟ .

بەلام وەرامێکی تر ، یاخود لێکدانەوەیەکی تریش هەیە بۆپێك‌هاتنی خۆشەویستي . . ئەمەیش هەر لە کارەساتی «چارەنووس» دەکات ، کە کەس ناتوانێ هۆیەکانی ڕوون بکاتەوە ، یاخود تەووژمەکەی بەربەست‌بکات ! . ئەمەیش بە زۆري لەگەڵ ئەو جۆرە خۆشەویستي‌ی گورج‌و گۆڵەدا ڕێك‌دەکەوێ کە پی‌ی‌دەڵێن : «خۆشەویستي‌ی یەکەم چاوپی‌کەوتن !» .

ئەوانەی ئەمە پێشبینی‌یانە ، چیرۆکێکی هەلبەستراوی کۆنی یۆناني دەهێننەوە بە بەلگە ، کە بە کورتی دەڵێ : لە «سەرەتای دوروست‌کردنی جیهاندا خوداکان مرۆڤیان کردووە بە دوو کەرتەوە . ئیتر لەوساوە هەر کەرتەی بە دوای کەرتەکەی تریدا دەگەڕێ . جا ئەگەر هاتو ئەو دووکەرتە لە شوێنێکدا چاویان بە یەکتر کەوت ئەو شەپۆلە بەهێزە توندوتیژە کە پی‌دەڵێن «خۆشەویستي‌ی بەکەم چاوپی‌کەوتن» . یاخود «تیری دڵداري» لەناویاندا دێت‌ودەچێ . . ئیتر دەم‌ودەست هەریەکەیان وا هەست بە خۆی دەکات ، کە ئەوی‌تر بەجواني‌یەکەی خۆی داگیری کردووە ، بە شەنگ‌و شۆخي و خوێن‌گەرمي‌یەکەی و گۆکەی چاوبەستی کردووەو ، دڵی سەندووە . ئەو ناوە نازدارەیش کە لەگەڵ ئەمودا ڕایدەبوێرێ ، وەك خۆی لە بەهەشتدا ببینێ وایە ! . . بەم ڕەنگە : گرفتاری دڵداري‌یەکەی ئەو دەبي‌و ، بە هەموو هەست‌و تاسەو تەزوویەکی خۆیەوە هۆگری دەبێ ، بێ ئەمەی خۆی پێبگیرێ . . . جا لەو کاتەدا کە گرفتاری ئەو دڵداري‌یە دەبێ ، بە لایەوە وایە کە دەنگی دڵدارەکەی هەر لە سازوئاواز دەکات ، کە گفتوگۆی دڵخوازەکەی بریتي‌یە لە چاوبەست‌کردنێکی پەسەند . . ئەو دڵداري‌یەیش کە بەم ڕەنگە بێ‌و بە سایەی سەرسوڕمانی هۆش‌و ئارەزووی لەشەوە پێکهاتبێ ، بە خۆشەویستي‌یەکی بێ‌هاوتا دادەنرێ کە بۆ ژن وپیاوەکە هەردووکیان خۆشي‌یەکی تەواو پێك‌دەهێنێ . هەروەها خۆشەویستي‌یش لەناوەند دڵتەنگي‌و

ﺩﻨﺎﺧﯚﺷﻲﺩﺍ ﻧﺎﮊﻱ ، ﻟەﻧﺎﻭﺩەﭼﻰ ! . . ﻫەﻧﺪێﻜﻰ ﺗﺮﻳﺶ ﻫەﻥ ، ـە ﻻﻳﺎﻧەﻭە ﻭﺍﻳە ﻛە ﺋﺎﻓﺮەﺕ ﻟە ﻻﻯ ﺋەﻭ ﭘﻴﺎﻭە ﺧﯚﺷﻲ ﻟە ﻛﺎﻣەﺭﺍﻧﻲ ﺩﺩﺑﻴﻨﻰ ﻛە ﭼﺴﺖﻭ ﭼﺎﻻﻙ ﺑﻰﻭ ﺭەﻧﺞﺑﺪﺍﺕ . ﭘﻴﺎﻭﻳﺶ ﺋەﻭ ﻛﺎﻣەﺭﺍﻧﻲﻳەﻯ ﻟەﻭ ﮊﻧەﻭە ﺩەﺳﺖﺩەﻛەﻭێ ﻛە ﺧﺎﻭەﻧﻰ ﻫەﺳﺖﻭ ﺗﺴەﺑﻰﻭ ﻟەﮊێﺮ ﻓەﺭﻣﺎﻧﻰ ﺋەﻭﺩﺍ ﺑﺠﻮﻭڵێﺘەﻭە . ﺩﻭﻭﺭ ﻧﻴە ﻛە ﺯﻭﺭﺑەﻯ ﺋﺎﻓﺮەﺗﺎﻧﻴﺶ ﺑە ﻻﻳﺎﻧەﻭە ﻭﺍﺑێ ﻛە ﺋەﻭ ﻣێﺮﺩە ﺑێﻬﺎﻭﺗﺎﻳەﻯ ﺋﺎﻭﺍﺗﻰ ﺑﯚ ﺩەﺧﻮﺍﺯﻥﻭ ﺧەﻭﻯ ﭘێﻮە ﺩەﺑﻴﻨﻦ ، ﺋەﻭ ﻛەﺳە ﺑێ ﻛە ﻣﺎﻭەﻳﺎﻥﺩەﺩﺍﺕ ﺳﻮﺍﺭﻯ ﻣﻠﻰ ﺑﺒﻦ . ﺑەڵﺎﻡ ﺋەﻭﻯ ﺭﺍﺳﺘﻲ ﺑێ ﺋەﻭەﻳە ﻛە ﻫﻴﭻ ﺋﺎﻓﺮەﺗێﻚ ﭼێﺸﻜەﻯ ﻛﺎﻣەﺭﺍﻧﻲﻯ ﻧەﻛﺮﺩﻭﻭە ﻟەﮔەڵ ﭘﻴﺎﻭێﻜﻰ ﺗﺮﺳﻨﯚﻛﻰ ﺑێﺩەﺳەڵﺎﺗﺪﺍ . ﻫەﺭﻭەﻫﺎ ﻫﻴﭻ ﭘﻴﺎﻭێﻜﻴﺶ ﻛﺎﻣەﺭﺍﻧﻲﻯ ﺭﺍﺳﺘەﻗﻴﻨەﻯ ﺩەﺳﺘﮕﻴﺮ ﻧەﺑﻮﻭە ﻟەﮔەڵ ﮊﻧێﻜﺪﺍ ﻛە «ﻧێﺮەﻛﻲ» ﮊﻳﺎﺑێ ﻟەﮔەڵﻴﺪﺍﻭ ﻛەﻣﻮﻛﻮﻭﺭﻱﻳﺸﻰ ﻫەﺑﻮﻭﺑێ ﻟە ﮊﻧێﺘﻲﺩﺍ ! . ﻟەﺭﺍﺳﺘﻴﺪﺍ ﻛەﻡ ﻫەڵﺪەﻛەﻭێ ، ﺭﯚﮊﮔﺎﺭ ﺭێﺒﺪﺍﺕ ﺑە ﻣﺮﯚﭪ ﻛە ﺑە ﺋﺎﺭەﺯﻭﻭﻯ ﺧﯚﻯﻭ ﺳەﺭﺑەﺳﺘﺎﻧە ﻫﺎﻭﺑەﺷﻰ ﮊﻳﺎﻧﻰ ﺧﯚﻯ ﻫەڵﺒﮋێﺮێ . ﺋەﻣەﻳﺶ ﺑﯚ ﺋەﻭ ﭼﺎﻛە . ﭼﻮﻧﻜە ﻓەﺭﻣﺎﻧﺪﺍﺭﻱﻯ ﺋﺎﺭەﺯﻭﻭﻯ ﺩڵ ، ﻟەﻡ ﺭﻭﻭەﻭە ، ﻫەﺭﭼەﻧﺪە ﺑە ﻫەڵەﺷﺪﺍ ﺑﭽێ ، ﺑەڵﺎﻡ ﺋەﻧﺠﺎﻣەﻛەﻯ ﺑێﻮەﻳﺘﺮە ﻟە ﺋەﻧﺠﺎﻣﻰ ﻓەﺭﻣﺎﻧﺪﺍﺭﻱﻯ ﻫﯚﺵﻭ ﺯﻳﺮەﻛﻲ ! . . ﻛەﺳێﻜﻰ ﮊﻳﺮﻳﺶ ، ﻛە ﻳەﻛێﻚ ﺩەﺑﻴﻨێﻭ ﺑە ﺩڵﻴﺪﺍ ﺩەﭼێ ، ﻟەﻭﺍﻧە ﻧﻴە ﻛە ﻟە ﺧﯚﻯ ﺑﭙﺮﺳێ : «ﺋﺎﻳﺎ ﺭێﺒﺪەﻡ ﺑە ﺩڵﻢ ﺋەﻡ ﻛەﺳەﻯ ﺧﯚﺵ ﺑﻮێ ؟» . . ﭼﻮﻧﻜە ﺧﯚﺷەﻭﻳﺴﺘﻲﻯ ﺭﺍﺳﺘەﻗﻴﻨە ﺩەﺑێ ﻟە ﺩڵەﻭە ﺑێﺘەﺩەﺭێ ، ﭘێﺶﺋەﻣەﻯ ﻫﯚﺵ ﺑﻴﺮﻯ ﻟێ ﺑﻜﺎﺗەﻭە . ﻟەﺩﺍﻳﻚﺑﻮﻭﻧﻰ ﺧﯚﺷەﻭﻳﺴﺘﻲﻳﺶ ، ﻭەﻙ ﻟەﺩﺍﻳﻚﺑﻮﻭﻧﻰ ﻫەﻣﻮﻭ ﮔﻴﺎﻧﻠەﺑەﺭێﻚ ، ﺳەﺭﺗﺎﭘﺎ ﻛﺎﺭێﻜە ﻟەﻛﺎﺭەﻛﺎﻧﻰ ﺳﺮﻭﻭﺷﺖ . ﻫەﺭﭼﻲ ﻛﺎﺭﻯ ﻣﺮﯚﭬﻴﺸە ﻟەﻡ ﺭﻭﻭەﻭە ، ﻛە ﺧﯚﻣﺎﻥ ﭘێﻰﺩەڵێﻴﻦ «ﻫﻮﻧەﺭﻯ ﺩڵﺪﺍﺭﻱ» ﻟەﺩﻭﺍﻯ ﺋەﻭەﻭە ﺩێ . ﻟێﺮەﻳﺸﺪﺍ ﺋێﻤە ﻭﺍﻯ ﺑە ﭼﺎﻙ ﺩەﺯﺍﻧﻴﻦ ﻛە ﺋەﻭ ﺩەﻣەﻯ ﺋەﻡ ﻫەﻧﮕﺎﻭە ﺩەﺳﺖﭘێﻰﺩەﻛﺎﺕ ، ﺑە ﺩﻭﻭﺭﻭﺳﺘﻲ ، ﺩﻳﺎﺭﺩﻱﻯ ﺑﻜەﻳﻦ . ﻭﺍﺗﺎ ﺋەﻭ ﺩەﻣەﻯ ﻛە ﻫﻮﻧەﺭﻣەﻧﺪەﻛە ﺩەﺳﺖ . ﺩەﻛﺎﺕ ﺑە ﺩﺍﺭﺷﺘﻨﻰ ﺋەﻭ ﻛەﺭەﺳﺘە ﺧﺎﻭﺍﻧەﻯ ﻛە ﺳﺮﻭﻭﺷﺖ ﭘێﺸﻜەﺷﻰﻛﺮﺩﻭﻭە . .

## ﺧﯚﺷەﻭﻳﺴﺘﻲ ﭼﯚﻥ ﺩەﺳﺖﭘێﺩەﻛﺎﺕ ؟

(ﺳﺘﺎﻧﺪﺍﻝ) ﻟە ﻧﻮﻭﺳﺮﺍﻭە ﺧﯚﺷەﻛەﻳﺪﺍ ﻛە ﻧﺎﻭﻯ ﻧﺎﺩە «ﻫﻮﻧەﺭﻯ ﺧﯚﺷەﻭﻳﺴﺘﻲ» ﺩەڵێ : «ﺧﯚﺷەﻭﻳﺴﺘﻲ . ﺑە ﺟﯚﺭێﻜﻰ ﺗێﻜﺮﺍﻳﻰ ، ﺋەﻭ ﻛﺎﺗە ﺩەﺳﺖﭘێﻰﺩەﻛﺎﺕ ﻛە ﻟە ﻧﺎﺩ ﺩەﺭﻭﻭﻧﺪﺍ «ﻟێﻚ ﻛەﻭﺗﻦ» ێﻚ ﭘەﻳﺪﺍﺑێ . ﺑە ﻫﯚﻯ ﻛﺎﺭﻯ ﺋﺎﺭەﺯﻭﻭﻯ ﺩڵەﻭە ، ﻳﺎﺧﻮﺩ ﺑە ﻫﯚﻯ ﭘەﺳەﻧﺪﻛﺮﺩﻥ ﻳﺎﻥ ﻧﺎﻭﺑﺎﻧﮕەﻭە . ﺑﯚ ﻭێﻨە ﺋێﻤە ﻟە ﭼﻴﺮﯚﻛە ﺑەﻧﺎﻭﺑﺎﻧﮕەﻛەﻯ (ﺗﯚﻟﺴﺘﯚﻯ)ﺩﺍ ، «ﺋﺎﻧﺎﻛﺎﺭﻧﻴﻨﺎ» ﻭﺍﻣﺎﻥ ﭼﺎﻭﭘێﺪەﻛەﻭێ . ﻛە ﻛﺎﺗێ ﭘﺎڵەﻭﺍﻧﻰ ﭼﻴﺮﯚﻛەﻛە «ﭬﻴﺮﯚﻧﻴﺴﻜﻰ» ﭼﺎﻭﻯ ﺑە «ﺋﺎﻧﺎﻛﺎﺭﻧﻴﻨﺎ» ﺩەﻛەﻭێﻭ ﻛﺎﺭﻭﺍﻧﻰ ﺳەﺭ ﺭێﮕﺎﻯ ﺋﺎﺳﻨەﻛە ﺑەﺟێﺩەﻫێڵێ . ﺑە ﺩەﻡ ﺑﻴﺮﻛﺮﺩﻧەﻭەﻳەﻛﻰ ﻗﻮﻭڵەﻭە ﻟە ﺧﯚﻯ ﺩەﭘﺮﺳێ : «ﭼەﻧﺪ ﺟﻮﺍﻧە ﺋەﻡ ﺋﺎﻓﺮەﺗە ؟ﺗﯚ ﺑڵێﻰ ﻣەﺑەﺳﻰ ﭼﻲ ﺑﻮﻭﺑێ ﻭﺍ ﻫەﺭ ﺗەﻣﺎﺷﺎﻯ ﺩەﻛﺮﺩﻡ ؟ ! . . .» .

ﺑەڵﺎﻡ ﻟە ﭼﻴﺮﯚﻛە ﻧﺎﺳﺮﺍﻭەﻛەﻯ «ﺑﻠﺰﺍﻙ» ﺩﺍ ﻛە ﻧﺎﻭﻯ (ﺋﯚﺟﻴﻨﻰ ﮔﺮﺍﻧﺪێ)ﻳە ، ﺋێﻤە ﭘﺎڵەﻭﺍﻧﻰ ﭼﻴﺮﯚﻛەﻛە ، (ﺷﺎﺭﻝ)ﻣﺎﻥ ﻭﺍ ﭼﺎﻭﭘێﺪەﻛەﻭێ ﻛە ﺭﯚﮊێﻚ ﻟە ﺭﯚﮊﺍﻥ ﺩەﻛەﻭێﺘە ﻧﺎﻭ ﮊﻳﺎﻧﻰ ﻛﭽەﻛەﻯ ﺋﺎﭘﯚﻯ ﺧﯚﻳەﻭە ، ﻟە ﻭێﻨەﻯ ﭘﻴﺎﻭێﻜﻰ ﺳەﺭﮔەﺭﺩﺍﻧﻰ ﺩڵﺸﻜﺎﻭﺩﺍ . ﺋﻴﺘﺮ ﻟەﻭ ﻛﺎﺗەﻭە . ﻛﭽەﻛەﻳﺶ ﺗﻮﻭﺷﻰ ﺩﺍﻭﻯ ﺋەﭬﻴﻨﻰ ﺋەﻭ ﺩەﺑێﻭ ﺋەﻭ ﺩڵﺪﺍﺭﻱﻳە ﺑەﺭﻧﺎﺩﺍﺕ ﺗﺎ ﺩەﭼێﺘە ﮔﯚڕەﻭە ! . .

ﺟﺎ ﺋەﮔەﺭ ﺋەﻭ «ﻟێﻚﻛەﻭﺗﻨە» ﻛﺎﺭﻯ ﺧﯚﻯ ﻛﺮﺩ ﻭ ﺗﻮﺍﻧﻲ ﺭﻭﻭﻯ ﻣﺮﯚﭪ ﻭەﺭﺑﮕێﺮێ ﺑﯚ ﺳەﺭ ﺋەﻭ ﻛەﺳە ، «ﺩﻭﻭﺭ ﻛەﻭﺗﻨەﻭە»ﻯ ﻛەﺳەﻛە ﺩەﺑێﺘە ﻫﯚﻳەﻛﻰ ﮔﺮﻧﮓ ﺑﯚ ﮔەﺷەﻛﺮﺩﻧﻰ ﺩڵﺪﺍﺭﻱﻭ ﺩﺍﻣەﺯﺭﺍﻧﺪﻧﻰ ﻟەﻧﺎﻭ ﺩڵﻭ ﺩەﺭﻭﻭﻧﺪﺍ . ﺋەﻣەﻳﺶ ﻟەﺑەﺭﺋەﻭەﻳە ﻛە ﺩەﺳەڵﺎﺗﻰ ﻫەﺭە ﮔەﻭﺭەﻯ ﺋﺎﻓﺮەﺕ ﻟەﻭەﺩﺍﻳە ﻛە ﻟە ﮔﻔﺘﻰ ﺧﯚﻯ ﺩﻭﺍﺑﻜەﻭێ . ﻳﺎﺧﻮﺩ ﻟە ﭘﻴﺎﻭەﻛە ﺩﻭﻭﺭﺑﻜەﻭێﺘەﻭە . ﭼﻮﻧﻜە ﭼﺎﻭێﻜەﻭﺗﻨﻰ ﻛﻮﺭﻭ ﻛﭽێﻚ «ﻛە ﻟە ﻳەﻙﻛەﻭﺗﻨﻰ» ، ﻳﺎﺧﻮﺩ ﮔﺮﻓﺘﺎﺭﻯ ﻳەﻛﺘﺮ ﺑﻮﻭﺑﻦ . ﻟە ﺳەﺭەﺗﺎﻯ ﺩڵﺪﺍﺭﻱﺩﺍ . ﻳﺎﺭﻣەﺗﻲﻯ ﺋەﻭە ﺩەﺩﺍﺕ ﻛەﻡﻭﻛﻮﻭﺭﻯﻭ ﺷﻮێﻨەﻛﺎﻧﻰ ﻛﺰﻱﻭ ﺑێﺪەﺳەڵﺎﺗﻰﻳﺎﻥ ﺩەﺭﺑﻜەﻭێ . . ﻛەﭼﻲ ﺩﻭﻭﺭ ﻛەﻭﺗﻨەﻭەﻳﺎﻥ ﻟەﻡ ﺳەﺭەﺗﺎﻯ ﺧﯚﺷەﻭﻳﺴﺘﻲﻳەﺩﺍ . ﺩەﺑێﺘە ﻫﯚﻯ ﺋەﻭەﻯ ﻛە ﻫەﺭ ﻛەﺳەﻳﺎﻥ ﭘڕﺑەﺩڵ ﺋﺎﻭﺍﺕ ﺑﺨﻮﺍﺯێﺖ ﺋەﻭﻯ ﺗﺮﻯ ﺩەﺳﺖﺑﻜەﻭێ . . . ﺗەﻧﺎﻧەﺕ ﻫەﺭﻭەﻙ ﻓﺮﻳﺸﺘەﻯ ﻧﺎﻭ ﺑەﻫەﺷﺘﻲ ﺩێﺘە ﭘێﺶﭼﺎﻭ ! . . (ﺳﺘﺎﻧﺪﺍﻝ)ﻳﺶ ﺑەﻡ ﻫەﻧﮕﺎﻭەﻯ ﺩڵﺪﺍﺭﻱﻳە ﺩەڵێ : «ﻫەﻧﮕﺎﻭﻯ ﺑﻠﻮﻭﺭﻳﻦ» . ﭼﻮﻧﻜە ﺑە ﻻﻯ ﺋەﻭەﻭە ﻟە ﭘﺎﺭﭼە ﺗەﺧﺘەﻳەﻙ ﺩەﻛﺎﺕ ﻛە ﺗﺎ ﻣﺎﻭەﻳەﻙ ﻟەﻧﺎﻭ ﻛﺎﻧێﻜﻰ ﺧﻮێﺪﺍ ﺩﺍﺑﻨﺮێ . ﺗﺎ ﺑﻠﻮﻭﺭە ﺑﺮﻳﺴﻜەﺩﺍﺭەﻛﺎﻧﻰ ﺧﻮێﻳەﻛە ﺩﺍﻳﺪەﭘﯚﺵﻭ ﺩەﻳﺨەﻧە ﺷێﻮەﻯ ﺑەﺭﺩە ﺑەﻧﺮﺧەﻛﺎﻧەﻭە ، ﺑەﺧﯚﻳﺎﻥ ﻭﭘﺮﺷﻨﮕەﻛﺎﻧﻴﺎﻧەﻭە . .

## ﭼﺎﻭﭘێﻜەﻭﺗﻨﻰ ﺩﻭﻭەﻡ

ﺟﺎ ﻫەﺭﻛﺎﺗێ ﺋەﻡ «ﻫەﻧﮕﺎﻭﻯ ﺑﻠﻮﻭﺭﻳﻦ»ە ﺗەﻭﺍﻭ ﺑﻮﻭ . ﺧﯚﺷەﻭﻳﺴﺘەﻛە ﻟەﺑەﺭﭼﺎﻭﻣﺎﻧﺪﺍ ﺩەﺑێﺘە ﻳەﻛێﻜﻰ ﻧﺎﺳﻚﻭ ﻧﺎﻭﺍﺯە ﻛە ﺯﻭﺭ ﻟە ﮊﻭﻭﺭ ﺭﺍﺳﺘﻲﻯ ﺧﯚﻳەﻭە ﺩەﻭەﺳﺘێ . ﻟەﻡ ﺭﻭﻭەﻭە (ﻣﺎﺭﺳێﻞ ﺑﺮﻭﺳﺖ) ﻛە ﻭێﮋەﻭﺍﻧێﻜﻰ ﭘێﺸﻴﻨﻴﺎﻧە ﺩەڵێ : «ﻫەﺭﻛەﺳێ ﻟە ﺋێﻤە

دەست بکات بە دڵداري . لەراستیدا کەسێکی ڕاستەقینەی خۆش‌ناوێ . کەسێکی وای خۆشدەوێ کە نەبووەو . بەڵام لە مێشکی خۆیدا دورروستی‌کردووە . ئەو جوانی‌یەیش کە ئێمە بە لامانەوە وایە خۆشەویستەکەمان هەیەتی ، لەراستیدا سەرچاوەکەی چاوەکانی خۆمانن ، نەك وێنەو شێوەی ئەو ! » . .

جا لەپاش ئەمەی ئەم هەنگاوی «دڵداري‌ی بلوورین»ە لە دەمی دووري‌ی خۆشەویستدا تەواودەبێ . ئیتر وای لێ‌دێ کە بتوانێ بیر لە چاوپێکەوتنێکی دووەم بکرێتەوە لەگەڵ دڵخوازدا ئیتر ئەو ترسەیش نامێنێ کە ئەم دووەم چاوپێ‌کەوتنە زیان بەبەخشێ بە خۆشەویستی‌یە ساواکەیان . . . ئەمیش لەبەر ئەوەیە . کە لەو دەمەدا تاسەو تەزووەکەمان ئەوە دەخاتەسەر ئەستۆی خۆی کە وێنەی ڕاستەقینەی خۆشەویستەکەمان لەبەرچاو بشارێتەوەو . وایشمان لێ‌بکات کە هیچ وێنەیەك نەبینین . ئەو وێنە «بلوورین»ە نەبێ کە پرشنگ‌دەدات لەناو ئەندێشەماندا . ئەو ئەندێشەیەی کە هەر خۆی ئەو وێنە بریسکەدارەی کێشاوە . هەر وەها وایشمان لێ‌دەکات کە گفتوگۆو قسەکانمان بەرگوێ‌نەکەوێت کە هۆشێکی پروپووچی ناشي پیشان دەدەت . هەروەها هیچ خەوش‌و کەم‌و کووری یەکی خۆشەویستەکەمان نەیێتە بەرچاو . ئەمەیش سەبارەت بەوەیە کە خۆشەویستی‌ی ئەم هەنگاوی دووەحە لە دەرروونی خۆمانەوە هەندەقوڵی نەك لە دەرەوە . جا لەم دەمی دووەمەدا دڵداري . بە جۆرێکی تێکراپێ . هەر لە مەیێکی کامەراني دەکات کە روون وپاك وبێگەرد بێ . ئەوەندە هەیە . ئاگر بە گڕو بڵێسەکەیەوە نامێنێتەوە . هەتا داری نەکەیتەسەر . لێرەیشدا سووتەمەنی‌ی خۆشەویستي بریتي‌یە لە هیواو تیژکردنی دڵداري . لە هەر جۆرێکدا بێ : ــ بە تیلایی چاو تەماشاکردن پێ . یان بە دەستگوشین . یاخود بە پێداهەڵدانی خۆشەویست . . .

## گومان گرفتاري زیندوو دەکاتەوە

جا ئەگەر ئەم کردەوە بژوێنەرانە کەوتنە برەوەوەو . بۆ یار ئاشکرا بوون . ئەوا لەبانی خۆشەویستی‌ی یەك‌لایی ، خۆشەویستی‌ی بەرامبەری پەیدادەبێ . ئەوەندە هەیە ئەگەر هاتو دڵدارەکە لە ئەندازەبەدەر جێ خۆی لە دڵی یارەکەی‌دا خۆش‌کرد . دوورنیە کە خۆشەویستی‌یەکەیان بە پێچەوانەی مەبەس دەربچێ . هەر بە جارێك لەناوبچێ ! . . . چونکە لای زۆر کەس خۆرشتی دڵداري بریتي‌یە لە گومان‌بردن‌و هەڵگەرانەوەی هەموو دەمي لەناوەند ڕووساردي‌و ڕووگەرمیدا . زۆر جاریش وا ڕێك‌دەکەوێ ، کە ئەم بارە فری نیە بەسەر تاسەو تەزووی ڕاستەقینەی دڵدارەکەوە . . بەم ڕەنگە دڵدارەکە دوور نیە جووڵەیەکي یارەکەی خۆی بە سووك‌کردنی خۆی بزانێ . کەچي دوورنیە ئەو جووڵەیە بەهۆی شەرمنی یاخود گیان‌سووکي‌ی یارەکەوە رووی دابێ . . بەرامبەر ئەم کردەوەیە ، ڕەنگە سەرچڵي‌ی دڵدارەکە ، کە هەر لە سەرچڵي‌ی باڵبازی نهێني دەکات ، بوویێتە هۆی لێك‌دانەوەی ئەو ئێش‌و ئازارە کە لە سەرئێشەوە پەیدادەبێ . کە نیشانەی ڕوودانی کارەساتی ناخۆشە . بێجگە لەمانە گەلێك شتی پڕو – پووچی تریش هەن . تێکڕا خۆشەویستەکان زووربەی بڕیاری خۆیانی لە سەر دەدەن . . . کە تەماشادەکەیت تیلایی چاوو . وشەکان شي دەکەنەوە . بۆنیشانەو بزووتنەوەکان هۆ دەدۆزنەوە . بێجگە لەوە بە هەزار لادا بیریان‌دەڕوات . هەر بۆ ئەمەی هۆی ئەو ڕووساردي‌یە بزانن کە لە یارەکانیانەوە ڕوویداوە . جا هەرچەند ئەو هۆیە بە لای خۆشەویستەکەوە شارراوە بمێنێتەوە – کە لە ڕاستي‌یشدا نە هۆ هەیەو نە ڕووساردي – دڵدارەکە زۆرتر بیر لە یارەکەی خۆی دەکاتەوە . خۆشەویستي‌ی یارەکەیشی زۆرتر دەچێتە دڵ‌و هۆشەوە . چونکە هەر خۆشەویستي‌یەك لە گلاراوي‌ی دڵەوە پەیدابێ ، هەر لەو دەرکە دەکات کە هەرچەند مرۆڤەکە خۆی پێوە خەریك بکات‌و دەریبهێ ئەو زۆرتر بچێتە ناو لەشیەوە ! . . کەواتە هەڵگەرانەوە . گڕ دەدا بە ئاگری دڵداري . . ئەو پیاوەیش کە خۆی دەخاتە بەرچنگی ئافرەتێکی چەواشەکار . هەر لەو پشیلەیە دەکات کە لەگەڵ گلۆڵەمووەکدا یاري‌دەکات ، کە لێ‌ی دوور دەکەوێتەوە نزیکی دەخاتەوە لە خۆی . کە لێشی نزیك دەبێتەوە دووری دەخاتەوە لە خۆی ! . . . دواکەوتن بە دوای دووڕداو . ڕاکردن لە دەست نزیك ، خوویەکی سووروشتي‌یە لە مرۆڤدا . لەمەدا ئەویش هەر لە پشیلە دەکات ! . .

بەڵام وەك دەردەکەوێ . هەرکاتێ ئافرەت ئەم چەکەی لە ئەندازەبەدەر بەکارهێنا لەگەڵ دۆستێکیدا . زۆر جاری وا هەیە ئەنجامی خراپ دەردەچێ‌و بە مەبەسی خۆی ناگات . چونکە لەجیاتي‌ی ئەمەی گڕو بڵێسە بە خۆشەویستي‌یەیان بدات . خۆشویستي‌یەکەیان لەناودەبات . (ڕیکامێیە) کە خاتوونێکی بەناوبانگ بووە لە دڵداریدا . ئەمەی لێ ڕوودابوو لەگەڵ

دۆستەکەیدا (بنیامین کۆنستان) . کە چیرۆك هەڵبەستێکی ناسراوبووە . ئەم دڵدارە بەسەزمانە لە چیرۆکە نەکرەکەی خۆیدا کە ناوی (ئەدۆلف)ە ئەم کارەساتەی بە درێژی گێراوەتەوە . کە لەراستیدا چیرۆکی دڵداریی نووسەرەکە خۆیەتی ! . .

ئافرەت هێز دەپەرستی و سامان ! . . .

لێرەدا پرسێك دێتە مێشکەوە :

ئەگەر هاتو پیاوێك حەزی لە ژنێك کرد . بەڵام ژنەکە حەزی لەو نەکرد . ئاخۆ هیچ هۆیەك هەیە دڵی ئەوی پێ نەرم بکرێ وەرامدانەوە بە پێی شوێن و سەردەم دەگۆڕرێ :

لە سەردەمە سەرەتاییەکانی کۆندا . پیاو چەکی هێزی لەشی بەکاردەهێنا . کابرا کچەکەی دەفڕاندو دووری دەخستەوە لەماڵی باوکی . ئەو بێ ! . . دوورنیە ئەمەیش لەبەرئەوە بێ کە ئەو دڵدارە هەر ئەوی هەڵبژاردووە لەناو کچاندا . کچەکە هەست دەکات کە دۆستەکەی بەم هەڵبژاردندی سەری بەرز کردۆتەوە . یاخود لەبەرئەوە بێ کە پیاوەکە . تازە بوو بە خاوەن و گەورەی . بەزۆری بازووی خۆی داگیری کردو ملی پێ کەچ کرد ! .

بەم ڕەنگە چەکی هێزی لەش ڕێگایەك بوو بۆ پیاو کە بیگەیێنێ بە مەبەسی ڕاهێنانی ئافرەتی یاخی یەوە بە ملکەچی یەوە بۆ خۆی . بەڵام ئەمە لە سەردەمەکانی زۆر کۆندا بوو . بەڵام لە سەردەمەکانی دوایی دا چەکی گەنج و سامان و هێزی گیانی هاتنەناوەوە . وەك ناوبانگ و دەسەڵات . . لە سەرگوزەشتەیەکی یۆنانی دا «جۆپیتەر»ی خودا دەبینین . بە هۆی ئەوەوە یارە خۆشەویستەکەی خۆی . «دانا»ی دەستگیر بووە . کە خۆی گۆڕیوەو بەرگێکی دەوڵەمەندانەی لەبەرکردووەو بە زێڕ یاریی کردووە ! . . .

بەڵام خۆشەویستیی ئافرەتی بە دیلگیراو بۆ گەورەکەی خۆی . لەوانە نیە کە لەخۆبایی بوونی پیاوێکی ئازادو سەربەرز دا – بمرکێنێتەوە . چونکە لەراستیدا ئێمە وامان دەوێ کە ئافرەت «ئێمە هەڵبژێرێت» . نەك بە نابەدڵ «لەگەڵمان گوزەران بکات» ! . . . داگیرکردنی ئازادو سەربەست بێ . لەبەرئەوە کەم هەڵدەکەوێ . خونکار کەنیزەکەکانی خۆی خۆش بوێ . واتا ببێتە دڵداریان . چونکە ئەوانە لە بەندیخانەدان . هیچیان بەدەست نیە ! . .

کەچی پێچەوانەی تەواوی ئەمەیش هەر ڕاستە . چونکە ئەو ژنەی لە هاویندا . هەموو ڕۆژێ دەچێ بۆ گوێئاو . بۆ مەلە کردن . کەم هەڵدەکەوێ بە خۆشەویستیی کەسێك گرفتار بکات . یاخود تاسەی پیاو بە تەواوی ببزوێنێ . ئەمەیش هەر لەبەرئەوەیە کە ژنەکە بەرەڵایەو هەموو کەس تەماشای دەکات . کە ئەمەیش لە ئەندازە دەچێتە دەرەوە ! بۆچ لە سەرگرتنی دڵداریدا هیچ خۆشییەك دەچێژرێ . کە پەردە لابرێ و پەرژین هەڵبگیرێ و . هیچ ئابڕوویەکیش بە ژنەکەوە نەمێنێ کە چەقی ڕێگای لێ بگرێ ؟ . .

بەڵام کە ژنەکە بە گران دەست بکەوێ . دەبێتە ئامانجێك بۆ پیاوەکە . بە کوڵی دڵەوە ڕاوەدووی دەنێ . بۆمێنە لاوێکی هەرزەکار کەدڵی دەچێ بە ئافرەتێکی لاسایی کەرەوەی وادا کەهەر لەسەر تەختی لاسایی کردنەوەکە دیویەتی . هەر لە خۆیەوە کردەوەو ڕووشتیوا یەجگار ناوازەی بۆ دوورست دەکات . کە هەرچەند گوێی لە دەنگی بێ و چاوی لە ڕووی بێ . وا دێتە پێش چاوی کە ئەو کردەوەو ڕەووشتانەی هەیە . کەچی لە ڕاستیدا هیچ کردەوەو ڕەووشتێکی لە وانەی نیە . کاتێ کە ئافرەتەکە دەبینێ لاسایی ی یەکێك لە چیرۆکەکانی (دیمۆسیە) یاخود (شکسپیر) دەکاتەوە . بەلایەوە وایە : ئەو کەسەی ئافرەتەکە لاسایی ی دەکاتەوە . هەرچی چاو بەست و دڵکێش کردنێکی هەبێ لەو ئافرەتەدا کۆبۆتەوە . کوڕەکە ناشی و نەشارەزا دەیێنێتەوە لە کەسایەتیی ڕاستەقینەی ئافرەتە لاسایی کەرەوەکە . لە تەمەنی ڕاستەقینەی لە چرچ و لۆچەکانی دەم و چاوی کە چراخانی بەزمگاهەکە دەیشارنەوە هەروەها هیچیش نازانێ لەبابەت دڵخراپیی ئافرەتەکەوە . یاخود کەش و فش و لەخۆبایی بوونەکەی . ئەمەیش لەبەرئەوەیە کە هێشتا لەگەڵیدا نەژیاوە تا تێبگات . لەم بابەتەوە . (بایرۆن) دەڵێ :

«ئەوە بۆتۆ ئاسانترە کە بمریت لەپێناو ئەو ژنەدا کە خۆشت دەوێ . لەوەی کە لەگەڵیدا بژیت !» .

هەروەها ئەو کچەیش کە گرفتاری ئەڤینی چیرۆك نووسێك دەبێ . هەرچی کردەوە گەورەکانی پاڵەوانەکانی چیرۆکەکەی هەیە . لەویدا دەبینێ . بەڵام ئاگای لەوە نیە کە باداری . جومگەکانی لەش لە کەڵك خستووە . کە وورگی تووشی نەخۆشیی خواردن ساز نەکردن بووە . لەبابەت گێژو ویژیی و تەمەڵیی ئەو چیرۆك نووسەیشەوە هیچ شتێك نازانێ . نەخوازەلا سەرگەرمی و توورەیی یەکەی .

به كورتي هەرچەند مرۆڤ به گران دەستگیري ، ئاسانتر پەسەندكردنو به دڵداچوونی كەسانی تری دەست دەكەویٚ .

## هونەری دڵداري

جا ئەگەر واتی . به پیٚی ئەو دەستوورانەی ناومان بردن ، ئەمە باشه بۆ دڵدار . كەهەر حەز دەكات به خۆشەویستراوي بمێنیٚتەوه خۆی بهێڵیٚتەوه به نەناسراوي ؟

كەس ناتوانیٚ ئەمه بڵیٚ . چونكه مرۆڤ گرفتار به دڵداري زۆری پێچیٚ هەست به ئارەزوویەكی بەهێز دەكات له دڵی خۆیدا . كه خۆیشی خۆش بویستریٚ له لایەن یارەكەیەوه . كەواته دڵدار به هۆی چی‌یەوه دەكاته ئەو مەبەسو ئارەزووەی خۆی ؟ هەتا سەردەمی كۆن بوو . ئافرەته جادووگەرەكان هەندیٚ دەرمانی چاوبەستكردنیان دەدایه . كاری خۆی به تەواوي دەكرد . هۆنراوەكانی كۆن كه له بابەت سەردەمی «ئۆڤید»و «تیۆكریتس»ەوه دەدویٚن . پەنجه بۆ ئەم دەرمانی جادووه دەكیٚشن . تەنانەت لەم چەرخەیشدا ، له ژووره سووكو ریسواكانی هەندیٚ گەرەكانی شارەكانی [پاریس]و [لەندن]و [نیۆیۆرگ]دا . هەندیٚ پیرێژنی گرژو مۆن دەبینین . كه هیچ رۆژێك نیه به سەدان جار ئەم پرسه پڕ له سەرگێژيو گلاراويیه . لەدەم لاوەكانەوه نەبیەن : «چي بكەم تا خۆشی بویٚم ؟ »

جا لەم رووەوه . بەسەرهاتەكانی مرۆڤایەتيی دوورو درێژ هەندیٚ ریٚگاو هەڵسانو دانیشتنو ، خۆنووناندنو ، فێڵی تایبەتیان پیشان دەدەن ، كەئیٚمه به هەموویان پیٚكەوه دەڵیٚین : «هونەری دڵداري» . هەندیٚكیان ئەمەنده ساكارن تەنانەت گیانلەبەرانیش بەشیان تیٚیاندا هەیه هەند – یٚكیشیان گرانو پیٚشكەوتووانەن ، تەنیا میٚشكی مرۆڤ دایهیٚناونو پەیی لیٚ بردوون .

ئەمانه گرنگترین ریٚن بۆ [دڵداري] :

### یەكەم : خۆرازاندنەوه

بەكارهیٚنانی ریٚگەی خۆرازاندنەوه ، له هەموو ریٚگاكانی دڵكیٚشكردن زۆرتر بلاوبۆتەوه . هەرچي سووروشته ، لەم بابەتەوه . پیٚش ئیٚمه كەوتووه . تەماشای گوڵەكان بكه . به هۆی رەنگاو رەنكيی خۆیانەوه پەپوولەو میٚشو مەگەز كیٚش‌دەكەن . بۆ ئەمەی لەكاتی خۆیدا تۆوی نیٚرومیٚ تیٚكەڵ به یەك بیٚ . هەندیٚ پەپوولەو جروجانەوەری تریش هەن به شەو خۆیان دادەگیرسیٚننو رووناكي دەدەن ، هەر بۆ ئەمەی له رەگەزەكەی تر بگەیٚنن كه بۆ [دڵداري] ئامادەن ! .

ئافرەتیش هەروا دەكات . خۆی بەناوازەترین بەرگو پۆشەنيو گەوهەرەكان دەرازیٚنیٚتەوه بۆ ئەمەی دڵی پیاوی پیٚ كیٚش‌بكا ، تا هەڵی بژێریٚ بۆ هاوسەریٚی خۆی . كەواته خۆجوانكردنو خۆرازاندنەوه له ئافرەتدا ئارەزوویەكی سووروشتیيه ! . .

### دووەم : بەربەرەكانی له سەركەوتندا

روووەرگێرانی رەگەنەكەی تر . بەم هۆیەشەوه دەكریٚ كه كاریٚكی وا له دڵدار بوەشیٚتەوه . كه كەسانی‌تر نەتوانن بیكەن دەبیني هەموو دڵداریٚك بۆ ئەوه رەنج دەدات كه له هونەرەكەی خۆیدا سەربكەویٚ . ئەمەیش لەگەڵیٚك ریٚوه جیٚبەجیٚ دەبیٚ : هەندیٚ پەلەوەر هەن خۆیان فڕیٚ دەدەنه ناو زۆنگەكانەوەو تیٚیاندا نوقوم دەبن بۆ ئەمەی گیای ئاوي بۆهاوریٚ میٚجكەكانی خۆیان دەربهیٚنن . كاتیٚ كه له [شاتۆبریان] پرسي : «بۆچ دەچي بۆ رۆژهەڵات ؟» . وای وەرام دانەوه ، گوتی : «مەبەسم ئەوەیه ناو دەربكەم . تاكچان منیان به دڵدابچیٚ ! . . . » . كه گەرایشەوه لەگەشتو گوزارەكەی ، كه لەناو خاكەكانی رۆژهەڵاتدا كردبووی ، هەندیٚ واتەی دڵداريی نەمری دەستكەوتبوو له [مادام دی نوای]ەوه ! . .

گەڵیٚك چیرۆكیش كه دانرواون هەر بۆ ئەوه بووه كه ئافرەتەكان تاسەو تەزووی دڵی خۆیانی تیٚدابیبنن ، بەو مەبەسەی كه دڵیان ببزوێنریٚ . بۆ ویٚنه چیرۆكي «میٚخه زیرینه» دەهیٚنینەوه كه له لایەن نرخ‌دانەری بەناوبانگ [سانت بیف]ەوه دانراوه .

. ئەگەر لەو هۆیانه بكۆڵینەوه كه نیازیان بەخشیوه به دڵی هونەرمەنده بلیمەتەكانی سازو ئاواز ، كه سازو ئاوازی ناوازەو تەرو تازه دانیٚن كه هەرگیز لەناو – نەچن ، له هەموویاندا به یەك ئەنجام دەگەین . ئەویش ئەوەتا كه ئەو سازوئاوازلیٚدەرانه ، لەراستیدا ویستوویانه ، تاسەو تەزووی دڵی خۆیان بگۆرنه سەرشیٚوەی سازوئاواز . هەروەها ویستوویشیانه ئارەزووه پەنگ‌خواردووەكانی خۆیان دەربرن ! دوایي : ئەو كەسەی یاریی [ڤەنس] دەكاتو خۆی تیٚدا ڤاڵ دەكات ، هەروەها ئەو ئۆتۆمۆبیل‌لیٚخورەی كه ئازایەتيی خۆی پیشان‌دەدات له لیٚخوریني ئۆتۆمۆبیلەكەیدا كه بەو تیژيیه شیٚتانەوه

ی ی‌دەخورێ ، لەگەڵ ئەو سەما – کەرەی کە هونەرمەندی نەوینیێ لە دەرخستنی ڕێك‌وپێکی ی بەژن‌وباڵیدا . . . ئەوانە هەموویان بە دوای ئامانجێکدا دەگەڕێن : ئەوەیش ئەوەتا کە کچان کردەوەو کارو سەرو شێوەیان پەسەندبکەن !

## سێیەم : ناوبانگی ئەو کەسە لە دڵداریدا

ئەو پیاوەی ناوبانگی بە سوارچاکي دەرکردبێ ، ئەویش یەکێک بێ ، وەك [دۆن جوان] . کچان حەزی لێ‌دەکەن . ئەو ...وە لەڕاستیدا ، دارێك بە دەستیەوە دەگرێ ، کە سامناکترین هێزی تێدایەو ، بە هۆی ئەویشەوە دەتوانێ کار ...کاتە دڵی ئەو کچە داوێن‌پاکانەی کە بە خۆیان دەنازن . واتا ...وانەی کە زۆر جاری وا هەیە خۆیان دەدەن بە دەستەوە ، لە کاتی بزواندنی ئەو ئارەزووەیاندا کە دڵدارێکی بەناوبانگ بپچڕن ...ۆ خۆیانو ، لەو ئافرەتەی داگیربکەن کە بەربەرەکانی‌یان ...گەڵدا دەکات ، یاخود دەستە خوشکیان ! .

ئەم ئارەزووی سوروشتی‌یەیش کە لە ناو ئافرەتاندا هەیە ، ئارەزوویەکی گرێ‌یاوي‌یە . بەشی زۆری لە لەخۆبایی – بوونەوە بەیدا دەبێ . هەندێکیشی لەبەر ڕێز نەگرتنی دڵ‌تەڕی‌ی ئافرەتە ناحەزەکەوەیە ، لەگەڵ ئارەزووی بە – هێزکردنی باوەڕ بەخۆکردندا لە ڕێگەی دەست‌کەوتنی سەرکەوتنێکی بەئەرك‌و ڕەنجەوە !

دڵداری بەناوبانگی بە دڵداري‌یەوە دەرچووو ، هەڵدەبژێرێ . بەڵام کە ناوبانگی بە دڵداري‌یەوە دەرچووو ، بەناو گشت کەسدا بلاوبووەو ، ئەم بارە دەگۆڕرێتە بارێکي ترەوە . ئیتر لەوە بەولاوە کچان ئەو هەڵدەبژێرن ، ژنان خۆیانی تێ‌هەڵدەسوون .

## چوارەم : خۆنوواندن لە هێزو ساماندا

هەرچی ئافرەتە ، هەموو دەم بە ئاواتی ئەوەوە یە کە پیاو بیپارێزێ لە دوژمن‌و پشتیوانی‌ی بکات . لەبەرئەوە ئەو پیاوە هەڵدەبژێرێ بۆ دڵداري‌ی خۆی ، کە لە هەموو پیاوێك باشتربێ بۆ گەیشتن بەم ئامانجە ! .

جا هەر چەندێ ئافرەتەکە کزو بێ‌دەسەڵات بێ ، ئەوەندە زۆرتر ئارەزووی ئەو پیاوە دەکات کە لە توانایی‌یدا هەبێ بەهۆی هێزو دەسەلات ، یان بلیمەتي ، یاخود سامانی خۆیەوە ئەو بپارێزێ‌و یارمەتي‌یشی بداتن .

## پێنجەم : چەکی دیاري‌و پێداهەڵدان

دیاري ناردنیش نرخێکی گەورەی هەیە لە دڵکێش‌کردنی خۆشەویستەکەدا . ئەم چەکەیش هەموو گیان‌لەبەرێك شارەزایەتی . هەندێ پەلەوەری گوێ‌دەلیا هەن ، هەروەها ئەسپیش ، پەردە ووردەی ڕەنگاورەنگی بریسکەدار ، پێشکەش بە دڵخوازەکەی خۆیان دەکەن . چۆلەکەیش لاسکی گوڵی لاولاوو گەڵای‌دار دەبات بە دیاري بۆ چۆلەکە مێچکەکەی هاوڕێ‌ی . بۆ ئەمەی دایانبخات لەناو هێلانەکەی هەردووکیاندا کە پێکەوە تێ‌یدا دەحەوێنەوە . لەبەر ئەوە «چۆلەکە بەهەشتیلێ»و ئافرەت هەر لە یەك دەکەن ، لەوەدا کە هەردووکیان ، لەپاش دەستکەوتنی هاوسەري‌ی خۆیان ، بیر لە ڕازاندنەوەی هێلانەکەی خۆیان دەکەنەوە ! . جالەبەرئەوە چاکزین دیاري کە دەزگیرانێك پێشکەشی دەزگیرانەکەی خۆی بکات ، ئەوەیە کە بابەتێکی جوانی وای بداتێ کە خۆی یاخود ماڵەکەی پێ‌ بڕازێنێتەوە ! . . یاخود بە بۆنەی هەندێ جەژن یاخود بیرەوەري‌ی خۆشەوە چەپکێ گوڵی پێشکەش بکات ! .

پێداهەڵدان بە یاریشدا ، لەلایەن دڵدارەکەیەوە ، یەکێکە لە شێوەکانی دیاري ناردن . زوربەی هۆنراوە دڵداري‌یەکان بریتین لە پێشاندنی کردەوەی شیرین‌و جواني‌و شەنگ‌وشوخي‌و پێدا هەڵدانی یار . بە زۆري ، هەموو کەس پێداهەڵدانی پێ‌خۆشە . چونکە هەر کامێکمان بگریت – تەنانەت ئەو کەسانەیش کە زۆر بە خۆیان دەنازن – هەست بە کەم‌و کووري‌یەك دەکات لە خۆیدا ، کەدەیەوێ پڕی بکاتەوەو تۆڵەی بۆ بکاتەوە بۆ وێنە ئافرەتی شەنگ‌و شۆخ لە زیرەکي‌ی خۆی دڵنیا نیە . ئافرەتی زیرەکیش پێویستی بە یەکێك هەیە پێ‌بڵێ جوانیت‌و ، ئەوەیش بچەسپێنێتە دڵیەوە . بەم ڕەنگە هەر کەسێ ئەوەی پێ‌خۆشە شتی وا بدۆزێتەوە دڵنیای بکات لەوەی کە خاوەنی ئەو کردەوەو ڕەووشتە جوانانەیە کە خۆی بروای تەواوی نیە کە ئەوانەی هەبێ . جا لەبەر ئەمەیە کە پێداهەڵدان ، هەموو کەسێك پێ‌ی خۆشە . کارێکی گەورەیش لە دڵی دەکات . چ ژن بێ ، چ پیاو لەمەدا یەکە . گەڵێك ئافرەتی وا هەبوون ، کە بێ‌بەش بوون لە جواني‌و لە دڵ‌کێش‌کردن ، کەچي بە درێژایی‌ی تەمەنیان پیاوان خۆشیان ویستوون ، هەر لەبەر ئەمەی کە توانیویانە باش بەو پیاوانەدا هەڵبدەن ! . . گەڵێك پیاوی

سەروچاو ناشیرینیش هەبوون . کە ئافرەتان پەرستوویانن . هەر لەبەر ئەمەی کە شارەزا بوون لە پێداهەڵدان بە جوانیی ئەو ئافرەتانەدا ! . . هەروەك دەردەکەوێ ، هەموو کەسێك حەز لەوە دەکات کە کردەوەو ڕەووشتە شارراوەکانی کە هێشتا ناوبانگی پێوە دەرنەکردوون یاخود لێی دەرنەکەوتوون ، پێیاندا هەڵبدرێ . هەرچی سەر کردەی لەشکرە ، ئەوەندەی پێخۆشە لەبابەت چاوەکانیەوە بروێی کە دڵکێش دەکەنو ، وەك ئاگر هەڵگیرساون . ئەوەندەی پێ خۆش نیە کە لە بابەت سەرکەوتنەکانیەوە لە جەنگدا پیێدا - هەڵبدەیت ! . .
چیرۆك‌بێژێکی بەناوبانگیش کەم بەتەنگ ئەوەوەیە کە پەسەندکردنی خۆت بەرامبەر نووسراوو چیرۆکەکانی پیشان بدەیت . کەچی کەلەبابەت زرنگانەوەی دەنگەخۆشەکەیەوە بدوێیت کە چ کارێك دەکات لەدڵ . دەم‌ودەست گوێت لێ‌دەگرێو . قسەکانت پەسەند دەکاتو ، لەخۆشیاندا گەشکەدار دەبێ !

## شەشەم : دڵڕاگرتن

ئافرەت لە دڵکێش‌کردنی پیاودا دەستێکی‌هەیە . بۆ ئەمەی ئەمە ڕۆشن بکەینەوە . هەر ئەوەندەی بەسە کە چیرۆکی [مادام دی مانتنون] بگێرینەوە . کە چۆن توانیویتی دڵی [لویسی چواردەهەم] ، خونکاری فەرەنسە داگیربکات ، لە کاتێکی وایشدا کە هەر ڕەنجەرۆیی لێ‌دەوەشایەوە ! . . ژنەکە لەو دەمەدا لە تەمەنی هەرزەکاري تێپەری کردبوو .

تەنیا پەیوەندي یەکێشی هەبوو بە خونکارەوە . ئەوەیش ئەوە بوو کە بووبووە دایەنی منداڵەکانی ، کە لە دڵخوازە جوانەکەی بووبووی . کە ناوی [مادام دی مونتسبات] بوو . ئەم ژنەیش کارێکی گەورەی کردبوو لە دڵی خونکاردا ، دەسەلاتێکی زۆریشی بە سەریدا هەبوو . کەچي لەگەڵ ئەوەیشدا دایەنەکە توانی خونکار لە بەربەکانێکەرەکەی خۆی بپچڕێ ، کە لە جوانیدا بێهاوتا بوو . تەنانەت لەوەیشدا سەرکەوت کە دڵخوازە جوانەکەی خونکار هەر نەیدەوێرا بە بیریشیدا بێت ! . . سەرکەوت لەوەدا کە خونکار بخاتەسەر ئەوەی مارەیشی بکات ! . . .

ئاخۆ ڕازی ئەم سەرکەوتنە سەیرەی چي بووبێ ؟ . .

لەپێشدا لە شێوەیەکی وادا خۆی لە خونکار نزیك‌دەخستەوە کە دۆستی ئاشتي‌یەو ، دەیەوێ ناوەند خونکارو دڵخوازە شۆخو شەنگەکەی چاك بکاتەوە . دڵخوازەکەی خونکار سوورشتێکی ئاگرینی هەبوو . ناشي‌یانە لە هەموو کەسێك کە خونکار بیدیایە دڵی کرمێ دەکرد . ئەمەیش بووبووە هۆی ئەوەی کە هەموو دەم ئاژاوە لە ناوەند هەردووکیاندا تازە بێتەوە . خونکاریش کە دیی لە دایەنەکەدا ، کە ناوبژي‌یان دەکاتو ، ئاشتیان دەکاتەوە ، جۆرە ساکاري‌و بەسەرزماني‌یەك هەیە . ئەو ئارەزووەی هەیبوو بۆ ژیانێکی بێ‌دەنگ‌و سەنگ هەروەك هەموو پیاوێك هەیەتی . دامرکایەوە . بە واتایەکی‌تر ئەو ڕەووشت‌و خووە جوانەی دایەنەکە هەیبوو بەرامبەری ، دڵی خۆش‌کردو کاری تێ‌کرد . بەمە [مادام دی مانتون] ، جەنگی یەکەمی بردەوە ! . . پاش‌ئەمەی [مادام دی مانتنون] دڵنیابوو لەوەی کە جێگای خۆی کردۆتەوە لە دڵی خونکاردا خووی‌دایە ئەوەی کە هاوبەشي‌ی پیاوەکەی خۆی بکات لە فرمانەکەیدا . کەزۆر بەتەنگیەوە بوو ! . . ژنەکە زۆر بە پەرۆشەوە بوو کە لێی جیانەبێتەوە . لەکاتی کاروبار هەڵسووراندنی خاکەکەیدا . گوێی لەو پەیام‌و بڕیارو نووسنانە دەگرت کە پەیوەندي‌یان بە فەرمانڕەوایی‌وە هەبووو ، بۆ خونکاریان دەخوێندنەوە . هەروەك شارەزایەکی وریا کە ئاگای لە هەموو شتێك بێت گفتوگۆی لەسەر دەکردن . تەنانەت دەسەلاتی ژنەکە گەیشتە ئەو ئەندازەیە ، کە کاربەدەستەکانی بانگ دەکردە جێگا تایبەتي‌یەکەی خۆی لە کۆشکەکەدا ، بۆ ئەمەی گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات‌و ئاراستەیشیان‌بکات ! . ژنەکە لەم ڕێگەیەوە ، توانی بە تەواوەتي دڵی خونکار داگیربکات . ئەمەیش لەبەرئەوەبوو ، کە ژنەکە بەسایەی زیرەکي‌ی خۆیەوە پەیی بەوە دەبرد کە هەر پیاوێ پیاوێ . لە هەموو شتێ زۆرتر بەتەنگ کاروفرمانەکەی خۆیەوە دەبێ . تەنانەت کاروفرمانەکری پێش ئەو ژنەیش دەخات کە خۆشي دەوێ ! . جا ئەگەر هاتو ژنەکە خەریکی ئەوە بوو لە کاروفرمانی بکات‌و ، ڕووی وەربگێرێ بۆخۆی ، ئەنجام بەوە دەگات ، پیاوەکە کەنەفتي بکات‌و ، بۆ ژنێکی‌تر بگەڕێت کەبزانێ ڕازی دەسەلاتداری بەسەر پیاودا لەوەدایە کە بەتەنگ کاروفرمانەکەیەوە بێ ! . .

## حەوتەم : سازو ئاواز ، وێنە ، چیرۆك

ئەم هیێ هونەرە ، لەکۆڕی دڵداریدا دەستێکی بالأیان هەیە . زۆر جاری وا هەیە پیاو ، ژنێك بەوە کێش دەکات بۆ لای خۆی کە چامەیەك لەهۆنراوەی [بۆدلێر]ی بۆ بخوێنێتەوە ، بە

ـتي لەبەر ڕووناكي يەكى كزى سووردا . ياخود لە شوێنێكى ـوماتدا كە كەسى تێدا نەبێ ، خۆىو ئەو ئافرەتە نەبێ ، ـجميك لە سازوئاوازى [شۆپان] ، ياخود [بيتهۆڤن] ، يان ـگەر]ى بۆ لێبدات ! . . لە ڕاڕەوو دالانو هۆڵەكانى ـگاى وێنەدا ، گەلێك دڵداري دەستيپێكردووە ! . . ئەو ـتوگۆيەى كە دەپچڕێ لە ناوەند دوو دڵداردا ، بەهۆى ـتێنەگەيشتنێكى ناكاوەوە ، گەلێك جار بەهۆى چيرۆكێكى ـزەوە دووبارە دەست پێدەكرێتەوە . بەم ڕەنگە ، گەلێك ـ . هونەرو خوێندەواريى دوولاي دەبنە هۆى ـتبوونەوەى ئەو دڵانەى كە سازوان لەگەڵ يەكتردا .

## هەشتەم : هاوبەشي لە كارو بارى زرنگكاريو ئايينيدا

هاوبەشي لە بيروباوەرى زرنگكاري ، ياخود ئاييني ، يان ـتمانيدا ، ياخود هاوبەشي لە باوەڕكردن بە هەر نامەيەك بێ لە ـندا ، هۆيەكى گرنگە بۆ بەهێزكردني خۆشەويستي . چونكە هەر كەسێ بە هێزو هەرەتەوە بڕواى بە بيرێك كردبێو بە گەرمييەوە هۆگرى بووبێ ، بە گرانە ئەمەى بۆ دەچێتەسەر كە هەموو دەم بەدڵ كەسێكى ترى خۆش بوێ ، كە لەو بيرەيدا هيچ هاوبەشي يەكى نەكات . بە پێچەوانەى ئەمە ، ئەگەر بێتو هاوبەشي لە ناوەند دڵدارو ياردا بێتەبوون ، بێئەمەى لە هيچ شتێ سڵبكەن ، ئيتر بە جارێك كامەراني ڕوويان تێدەكات . ئەمە لەناو ئەو دڵدارانەدا باوە كە هەموويان يەك پيشەيان هەيە . چونكە هيچ شتێك لەوە خۆشترنيە كە دڵدارو فرمان پێكەوە كۆببنەوە لە ناوەند هەردوولايياندا .

## بەخێوكردني دڵداري لەپاش پەيدابووني

كە لە شوێني مێبازييەوە گواستمانەوە بۆ شوێني لەدايكبووني دڵداري ، ئەوفرمانەمان دێتە سەرشان كە ئەم كورپەيە بە خێوبكەينو پێيبگەيێنين ، تا دەبێتە خاوەن هێزو گوڕى خۆى . ئەم فرمانەيش زۆر گرانە . چونكە ئەندازەى مردن لە دڵداريدا . لەم تافى ساوايييەدا يەجگار گەورەيە . جا لەبەر ئەوە ، پێويستە زۆر بەتەنگ گەورەكردني ئەو دڵدارييەوە بين ، لەپاش هەنگاوى يەكەمى ، كەلەو دەمەدا هەردوو دڵدار

دەوڵەمەندن لە بيرەوەرىو گفتوگۆو قسەى نەستەقدا كە بۆ يەكترىى دەگێڕنەوە ، لەناوەند دەستلەملكردنو ماچەكانياندا . جا ئەگەر هاتو لافاوى گفتو — گۆى خۆش نيشتەوە ، دڵدارەكان لەكاتى بەيەكگەيشتنياندا بێدەنگوسەنگيو ملتيو سەرلي شێواوي داگيريان‌دەكات . جا لێرەدايە كە دڵداريى ساوا تووشى تەنگوچەڵمەى مردنێكي زوو دەبێ ، بێتوئەگەر خاوەنەكانى زووبەزوو چارەى نەكەنو دەرمانى هێزى نەدەنێ . لەوانە لە هەموويان گرنگتر ئەوەيە كە دڵدارەكە بزانێ چۆن «خۆى تازە دەكاتەوە» دەبێ لە هەموو چاوپێكەوتنێكاندا گفتوگۆى خۆشو دڵبزوێن بهێنێتە ناوەوە ، كە هەتا درێژەى پێبدات بە پێزترى لێ‌بێ . جا لێرەدايە كە جياوازيى ناوەند دڵدارێكى دڵكێشەرو دڵدارێكي دڵكێش‌نەكەر دەردەكەوێ ، لە گفتوگۆكەيدا . يەكێكى تريش لەو دەستوورانە ئەوەيە . كە بۆ ئەمەى گەشە بە دڵداري بدرێ ، پێويستە يارەكە ڕێگاى وا بۆ ئاسان بكرێ كە بتوانێ بێپەروا هەڵبسىو دابنيشێ لەگەڵ دڵدارەكەيدا لە كاتى تەنياييياندا ! . چونكە هيچ شتێك لەوە ناخۆشتر نيە بۆ مرۆڤ كە خۆى ناچار ببينێ لە بەردەم خۆشەويستەكەيدا ڕووكەشێكى دووروستكراوى وا لە خۆى بدات كە سەر لە پياو تێكبداو ، هانەى بدات بۆدەربازبوون ، ياخود بۆ خۆدزينەوە لەو ، يان چاوتێكەوتني ، بەلام بە ڕوويەكى خەمبارەوە ! . . دواى ئەمە هونەرى ڕێكخستني بەيەك — گەيشتن دێ كە دەبێ لە جێگايەكى پەسەندو ناوازەدا بێ . . دڵدارى شارەزا ئەو كەسەيە كە بزانێ خۆشەويستەكەى چ كاتێ شوێني چۆڵ‌وهۆڵي پێ‌خۆشەو ، چ كاتێكيش شوێني بەزمو ڕەزمي پڕ لەدەنگەدەنگ پەسەند دەكات ! . . كەى دەيەوێ بچێتە گەشت لەبەر تيشكى مانگەشەوداو چ‌كاتێكيش ئارەزووى بينيني چيرۆكێكى لاسايي ى پێكەنين هێنەر ، ياخود مەرگەساتێكى توندوتيژ دەكات ! . ئافرەتيش لە پياو باشتر لەم شتانە تێدەكات . لەبەرئەوە پێويستە پياو هەڵبژاردني جێبەزمەكانو جێى لاساييكردنەوەكانى دەمى دڵدارييان بۆ ژن بەرەڵلا بكات .

چوارەم دەستووریش ئەوەیە : کە دڵدار زاڵ بێ بەسەر دەمارە مێشکي یەکانی خۆی‌دا . لەکاتی تەنگ‌وچەڵەمەکانی دڵداریدا . جا لێرەدا . وا باشە بۆ پیاو کە دڵنیا بێ لەم ڕاستی‌یە کە ئافرەت زۆرتر خاوەنی هەست‌و تاسەو تەزووە . دەمەقاڵێ‌و قسەی خۆشی ئەمەندە کاری تێ‌ناکات . کە ڕووخۆشي‌و قسەی شیرین‌و ئارام‌گرتن‌و بێ‌دەنگي کاری لێ دەکات . زووربەی ژیانی خۆی بە دیلي‌یەوە ڕادەبوێرێ لەژێر چنگی دەمارە مێشکي‌یەکانیدا . شەپۆلەکانی دەروونیشی هەر لە شەپۆلەکانی زریگەورەکان دەکات . جا لەبەرئەوە ، پیاو یاخود مێردی تێگەیشتوو ئەو کەسەیە کە ووریای دەمارەمێشکي یەکانی خۆی دەبێ‌و ، ڕێ‌یان پێ‌نادات لە ئەندازەی خۆیان دەربچن . تەنانەت دەبێ وەك زری‌وان بێ . کە ڕووی کەشتی‌یەکەی دەکاتە گێژەڵووکە . . . پەردەی کەشتي‌یەکە خاو دەکاتەوەو ، بە هیوایەکەوە چاوەڕوانی دەکات . تا گێژەڵووکەکە دەبڕێتەوە . کەچي لەگەڵ ئەوەیشدا . خۆشەویستي‌ی زری‌ی هەر لە دڵدا دەمێنێ ! . زری‌ی هەر خۆش‌دەوێ !

## هونەری خۆپاراستن لە توورەیی‌ی یار

لێرەدا چەند دەستوورێکي هەیە . لەم هونەرەدا ، کە بە کەڵکی هەردوو ڕەگەزەکە دێ .

[یەکەمیان] : ئەوەیە کە بە تەنیا پێکەوە دەبن . ڕووخۆشي‌و قسەشیرینی‌یەکی تەواو بۆ یەکتري پیشانبدەن لێرەیشدا هەروەك چاوپێ‌کەوتنەکەی یەکەمیان‌وایە ! .

[دووەمیان] : ئەوەیە کە گیانی بەزمخوازي‌ی خۆیان لە هەموو شوێن‌و کاتێکدا دەربخەن . دەبێ لەو دەمەقاڵێ‌یانەیشدا کە بە دڵشکاوي‌یەوە دەیکەن بیرەوەري‌ی پێشوو نەهێننەوە پێشەوە .

[سێ‌یەمیشیان] : ئەوەیە کە دڵ‌کرمي‌کردن لە یەکتري ، بخەنە سنوورێکی یەجگار تەنگ‌و تەسکەوە . خۆیشیان بپارێزن لەوەی کە دڵ‌کرمي‌یی خۆیان ئاشکرا بکەن . هەروەها خۆیشیان بپارێزن لەوەی کە لەگەڵ یەکترا ئاش‌و ماش بکەن . یاخود بایەخ بە یەکتر نەدەن . دەستووری [چوارەم]یش : ئەوەیە کە ژن‌و مێردەکە ناوبەناو – بام بڵێ‌ین هەر ساڵە جارێك – چەند ڕۆژێك لە یەکتر جوێ ببنە . ئەمیش بۆ ئەوەیە ک دڵداري‌یان بژێتەوەو سەرلەنوێ . گڕی ئاگرەکەی بلێس بسێنێتەوە .

[دەستووری پێنجەم]یش : ئەوەیە کە هەر لە خۆیانەوە ناوبەناو . نامەبۆ یەکتر بنێن . چونکە ووشەی نووسراو . جۆرێکی تێکرایی . لە ووشەی گوتراو ناسکترو شیرینترە . لەبەرئەوەیە کە ئەوە هەست‌و تاسە دەبزوێنێ‌و تازەی دەکاتەوە .

دوایی . لەسەر مێردی تێگەیشتوو پێویستە . کە هەموو د لە پیشاندانی خۆشەویستي‌ی خۆی نەکەوێ لەگەڵ ژنەکە خۆیدا . دەبێ خۆشەویستي‌یەکەیشی لە شێوەیەکی پڕ هەست تاسەو تەزوودابێ . پێش‌ئەمەی ببێتە ژنی چي‌ی لەگەڵ‌کردووە تا دڵی کێش‌کردووە . دەبێ ئێستەیش هەروا لەگەڵی بجووڵێتەوە . ئەگینا لە گیانی خۆی وەبڕس دەبێ‌و . پاشەجاریش ئارەزووی یەکێکي‌وا دەکات کە واژەی دڵداري‌ی گەرم‌وگوڕ لێ‌ببێ‌ە ئەو قسانەی کە لە سەرەتای دڵداري‌ی‌دا پێوە ڕاهاتبوو ! . کەواتە ئۆباڵتان بە ئەستۆی خۆتان . پاشەج پەشیمان دەبنەوە !

١٩٦٧ - ٣- ٤

# ڕێژەیی

نووسینی :
معتصم سالەیی



لەساڵی (١٩٠٥)ی زایینیدا زانای ئەڵمانی ئەلبێرت ئەنشتاین توانی پەی بەتیۆری ڕێژەیی ببات واتە (النظریة نسبیة) ، بەپێی ئەم تیۆرە مەسەلەی کاتو شوێن ڕاستییەکی نیسبینو موتڵەق نین بۆنموونە گەر هاتو بەتەنیشت جۆگەلە ئاوێکدا بڕۆیت بەو مەرجەی ئاوەکە بکەوێتە لای دەستی چەپتەوە ، کاتێ گەڕانەوەت بە ئاراستەیەکی پێچەوانەی جاری پێشو ئەوا بێگومان جۆگەلەکە دەکەوێتە لای دەستی ڕاستەوە . ڕاست ، چەپ ، بان بن زورجاریش قەوارە واتە گەورەییو بچووکی هەموو ئەم زاراوانە بەگشتی ڕێژەییو نیسبین . زۆر هەن پرسیار دەکەن ودەڵێن گەر زەوی خڕ ، واتە گۆیی بوایە چۆن ئەوانەی دەکەونە بنیەوە بەرنابنەوە ؟ بەم شێوەیە زۆربەی نەخوێندەواران گومانلە خڕی زەوی دەکەنو بەڕاستی نازانن . بەڵام دەبێت وەکو لەوەپێش باسمان کرد کەشوێنو جێگا نیسبین هەر لەبەرئەوەش مرۆڤ لەسەر زەوی نەلەسەرەوە دەژینوەنە لەبنیەوە جگە لەموگناتیسیی زەوی . بەپێی ئەم تیۆرە جوڵانەوەی تەنەکان ڕاستیەکی سەدا سەدی نییە ، جیگۆڕینی تەنێك کە بەجووڵانەوە ناودەبرێت ڕاستیەکەی بریتییە لەگۆڕینی شوێنەکەی بەنیسبەت تەنەکانی ترەوە کە نەگۆڕن (ثابت) . جووڵانەوەی تەن بەچەند شێوەیەك خۆی دەنوێنێت ، گەر لەفڕۆکەیەکەوە بەردێکمان فڕێ دایە خوارەوە بەنیسبەت فڕۆکەوانەکەوە بەردەکە بەهێڵێکی ڕاست بەردەبێتەوە هەمان بەربوونەوە بەنسیبەت بینەرێك لەسەر زەوی بەهێڵێکی چەماوە خۆی نیشان دەدات . بەهەمان جۆر کاتو خێرایی هاوکێشەیەکی پێچەوانە (معادلة عکسیة) پێك دەهێنن ، چونکە خێرایی تەنێك کاردەکاتە سەر کاتی جووڵانەوەکەی واتە ئەو ماوەیەی تەنێك دەیخایەنێت بەخێراییەکی دیاریکراو بۆگۆڕینی جێگەکەی ، بەپێی ئەم پەیوەندییە تا خێرایی زیاد بکات کات کەم دەکات هەروەها پێچەوانەکەیشی ڕاستە .

هەروەها ووشەی (ڕاستی) شتێکی ڕێژەییە ، چونکە تائێستا تەرازوویەك یان سەنگێك نییە پێی هەڵبسەنگێنرێت بەڵام ئەم دیاردەیە لەلایەن هەندێك کەسەوە بەشێوەیەکی نارێك تەماشا دەکرێتو دەخرێتەکار بەو بیانووەی کەگوایە (ڕاستی) تەنێك یاخود ماددەیەك نییە کەنەگۆڕو مووتڵەق بێت لەم تێڕوانینە تەسکەوە بۆی دەچنو ئەوە بەڕاست دەزانن کە مرۆڤ بۆیهەیە بەپێی سوودو قازانجی خۆی بەهەموو کارێك هەڵسێت !

ئەگەر ڕووی دەممان لەو کەسانە بکەین ئەوا دەبێت بڵێین کەوا لە کاتو زەمانێك قۆناخێکی ژیانی مرۆڤدا بەپێی چەند تیۆرو بیرۆکەیەك گەلێك نزیکترن لە چەند بۆچوون تیۆرێکی دیکە . جا بۆیە دەبێت ئەو بیرۆکەو تیۆرانەی دەبنە مایەی ڕەزامەندی خەڵکانێکی زۆر خۆیان لەچەند دیاردەیەك گێل ناکەن چونکە خۆیان وەکو خاڵی سەرەتاو دەست پێکردن دەبنە هەوێنی چەند ، ڕاستییەکیتر ! وەبەو جۆرە گەشەو پەرەسەندن هەر لەبرەودا دەبێت :

تێگەیشتنو زانیاری مرۆڤ لەجووڵانەوەیەکی مێژوویی دایە لەهەر قۆناخێکی ژیاندا لەئاستێكو ڕادەیەکی لەنگەر گرتوودایە ، بەڵام ئارادەیەك ویستی مرۆڤو پێویستیەکانی ئادەمیزاد ، جیهانی مەنگی پێ دەشڵەقێنێتو ووزەو هێزی

بزواندنی لیٚ پەیدا دەکات . لەڕاستیدا بەرەو پێش‌چوونی زانست وزانیاری تەعبیر لەجۆری بۆچوون ئەندێشەو بیری ئادەمیزاد دەکات لەوسەردەمو چەرخەدا جالەم ڕوانگەیەوە دەردەکەوێت کە سەرهەڵدانی چەند زانیاریەك لەرادەیەکی ڕاستی‌دا دەبن‌و ، خۆی مرۆڤ ڕێژەی ڕاستی بۆ دادەنێت ، جابۆیە چەندان بیرو زانست لەسەردەمێکی ژیانی مرۆڤ‌دا بەراسترین‌و مەنتیقی‌ترین زانیاری دانراون ، بەڵام ڕۆژی ئەمڕۆمان کەسەدەی بیستەمەو سەدەی ڕۆکێت‌و ئەتۆمە ڕەتی گەلیٚ لەو زانستانە داوەتەوەو ئەمرۆ جگە لەبیردۆز هیچ ناوێکی تریان پیٚ نابەخشرێت لێرەوە بۆمان روون دەبێتەوە کەزانست‌و زانیاریش مایەی ڕێژەیی‌یان تێدایە هیچ یەکێکیان بیٚ کەم‌وکورتی نەگەیونەتە پلەی تەکامول ، جابۆیە لەکۆنەوە هەر زانیاریەك تەواوکەری تاقی‌کردنەوەو تەجروبەی پێش خۆی بووە . لەکۆندا باوەڕ وابوو کەئەتۆم دابەش ناکرێت‌و بچووکترین بەشی ماددەیە ، بەڵام ئەمرۆ سەلمێندراوە کەدابەش دەبێت بۆ پرۆتون‌و نیوترۆن ئەلیکترۆن . دان‌نان بەنیسبیەتی زانستی ئەوە ناگەیەنێت کەنکۆڵی لەڕاستی دەکرێت بەڵکو ئەوە دەگەیەنێت کە کاتێك ناتوانرێت ئەوپەڕی ڕاستی ببینرێت . بەهۆی پەرەسەندن‌و پی‌گەیشتنەوە دەگەینە زاراوەو ڕوانینی تازەتر . لەژێر کاریگەری ئەم بیردۆزانەدا زۆر لا بەبیانووی ئەوەی ڕاستی شتێکی بەرجەستەو زانراونی‌یە پیٚ‌شێلی‌گەلیٚ دیاردەی واقعی دەکەن‌و ، خۆیان لە زۆر مەسەلەی ڕەواو ڕەسەن گێل دەکەن هەروەها تێڕوانینی نەزانینانەیان لەم تیۆرە گەلیٚ ماف‌و هەقی ڕەوا دەخەنە ژێر لێوەوەو لە حیسابی خۆیانی دەسڕنەوە . نووسەری ژاپۆنی‌ناسراو (ڕیۆنسکی ئاکوتاچاوا) لەچیرۆکی (ڕاشومون)دا پەنجەی بۆهەمان مەسەلە درێژ کردوە دەیەوێت هەقێك لە جەنجاڵی بۆچوونە ناڕاستەکانی خەڵکی دەربخات لەم چیرۆکەدا میرێك بەدەستی ڕیٚ گرێك دەکوژری‌و ژنەکەیشی لەلایەن هەمان ڕی‌گرەوە ئەتك دەکرێت ، لەکاتی لی‌کۆڵینەوە لەم مەسەلەیە هەر یەکیٚ لەوانەی ئاگایان لەڕەشە کوژەکە بووە یاخود بەشداریان کردووە بەجۆرێکی تایبەت‌و جیاواز باسەکە دەگێڕێتەوە . کاتێك کەگیانی میرە کوژراوەکە ئامادە دەکەن بەجۆرێکی جیاواز بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە جیاواز لەو گێڕانەوەیەی کەدار بڕێك دەیگێڕێتەوە کەسووریشە لەسەر ئەوەی بەتەواوەتی لەکوشتنەکە ئاگادار بووە هەریەك لە ژنەکەیش‌و جەردەکەیش بەشێوەیەکی جیاوازتر باسی لیٚ دەکەن . . . بەوجۆرە هەرکەسێك ڕاستی‌ی کوشتنەکە بەپی‌ی بۆچوون‌و تی‌ڕوانینی تایبەتی خۆیەوە دەیگێڕێتەوە .

ڕێبازی فەلسەفی (پڕاگماتیزم) زادەی بیری سەرمایەداری ڕۆژئاوایی‌یە بەتایبەتی سەرمایەداری ئەمریکی . لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم‌و سەرەتای سەدەی بیستەمدا ئەم فەلسەفەیە لەلایەن چەند خاوەن بیرێکی ئەمریکایی‌یەوە سەری هەڵدا ، وەکو (وەلیەم جێمس) و (چارلس پێرس)و (جۆن‌دیوی) باوەڕکەران بەم فەلسەفەیە ئەوانەن یاخود ئەوانەبوون کە تاقی‌کردنەوە بە مەشخەڵی ڕی‌ی ژیان دادەنێن .

ئەمانە ڕاستی بەسوودو بەرژەوەند دادەنێن بەم پی‌یە ئەم خاوەن‌بیرانە باوەڕیان بەتاقی کردنەوەیەکی ئاسۆ تەسکەو بەس چونکە هەر بەرهەمێك ئەنجامی کارو تاقی کردنەوەیەکی تایبەتی‌یە بەڵام لای ئەمان سوود بەخشەکانیان (واتە سوود بەخشی ئەنجامی تاقی کردنەوەیەك) بەڕاستی دەزانن‌و دانی خێری پیادا دەنێن . خەونی گەورەی سەرمایەدار پارەو پوولەو کۆکردنەوەی ماڵاتە ، پەیتا پەیتا هەوڵی خۆبەرزکردنەوە دەدات . (هنری ئادەمز) کە یەکێکە لە براگماتیستەکان ڕووبەڕووی ئەو کەسانە دەوستێت کە لایەنگیری هەڵوەشاندنەوەی کۆیلایەتی دەکەن‌و دەڵێت : ( ئابووریی وولات پشت بە لۆکە دەبەستێت هەروەها لۆکەش پشت بەبەندێتی دەبەستێت جالەبەرئەوە دەبێت وولات بەپی‌ی بەندایەتی هەڵسووڕێت)[1] .

وەزعیە نوێیەکانیش (الوضعيون الجدد) پشت بەتاقی‌کردنەوەی ڕووت دەبەستن (وە وەزعیە نوێیەکان دەڕواننە زاراوە گشتیەکان وەك یاسای پەرەسەندنی کۆمەڵ ، چین ، نەتەوە ، سەرمایەداری ، جەنگ وگەلیٚ شتی تر کەناچنە ژێر ڕکێفی تاقی کردنەوەوە ، تاك بەسەرپی‌یەوە هەستی پیٚ ناکات بۆیە ناتوانرێت ڕاستەوخۆ ڕاستی‌و ناڕاستیان بسەلمێنرێت پێویستە بەپی‌ی بۆچوون بچینە نێو کۆمەڵی «مانا داپۆشراوەکان» یەوە)[2] ، هەرکەسەو بەپی‌ی بۆچوون‌و ڕوانینی خۆی‌و لایەنگیری چینایەتی تایبەتی خۆی پێوانەی بۆدادەنێت وپەیڕەوی دەکات . ( هیگل ڕاستی بەنانیشتەجیٚ دادەنێت ڕسروستیش بەپڕو پووچ دەبینێت ودەڵێت پێویستە لەسەر مرۆڤ پەنا بەرێتە بی‌کۆتایی بۆموتڵەق بۆگیان لەوپەڕی پڕشنگداریتیدا)[3] .

ئابووری سروشتی پەیوەندی بەرهەم هێنان وەك بنیاتێکی ژێرەوە کار دەکاتە سەر بنیاتی سەرەوە وەکو جوری بیروباوەڕو فەلسەفەو ئەخلاق‌و گەلیٚ شتی تری مرۆڤ لە سەردەمێکی دیاری کراودا . خاوەن ئایدۆلۆژیەك دەڵێت :

ئاسیاوێك کەبەدەست دەسوڕێنرێت کۆمەڵگایەکی دەرەبەگیت دەداتیٚ وەئاشێك کەبە هەڵم ئیش دەکات

کۆمەڵگایەکی سەرمایەداری پیشەزایت دەداتێ بێگومان هەر قۆناخێك لەو قۆناخانەیش جۆرە بیرو باوەڕو فەلسەفەو ئایدۆلۆژیەتێك دادەڕێژیو دەیسەپێنێت بەسەر ئەو کۆمەڵەدا ، بەجۆرێك کە پاکیو قودسیەتێکی وەهای دەداتێ کە بەهیچ جورێك نەتوانرێت چەنو چۆنی لەسەر بکرێتو گومانی تیابکەوێ . بۆ نموونە ماوەیەك لەمەوبەر کە قۆناخی دەرەبەگایەتیمان دەبری ، پیاوان دەبینران دوانو سیان بگرە زور جار ، چوار ژنیان دەهێنا بەڵام ڕۆژی ئەمرۆمان کەقۆناخێکی ترە کێ دەتوانێت دوو ژن بهێنێت ؟

یاخود ڕێزی مانگا گەلێ گەورەیە لەهیندستان ، تەنانەت سەربرینی گەورەترین گومرابوونە هەر هەمان مانگا نرخێکی تری هەیە لای ئێمە ، گومانی تێدا نیی‌یە کە دابەشبوونی دارایی ئەم حوکمە دەکات لەو دوو ناوچەیەدا ، چونکە دارایی هیندستان کزەو بەرهەم هێنانی شیرو ماستو کەرەو جۆرەکانی تر گەلێ قازانجترە لەگۆشتەکەی ،جا بۆیە ئەم دیاردەیە دینامیکیەتی وەرگرتوەو جۆرە قودسیەتیکی پێ بەخشراوە بەپێی تێپەڕبوونی ڕۆژگار سیمای ئایینیی هەڵگرتووە .

بەهەمان شێوە چێژ وەرگرتنو جوانی نیسبیەو موتڵەقو وەستاو نیی‌یە . چێژو جوانی دەگۆڕێت لەلای مرۆڤ ، لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ، وەلەسەردەمێکەوە بۆسەردەمێکی کە یاخود چێژ وەرگرتنو ڕوانینی جوانی دەگۆڕێت بەگۆرانی تەمەنو پایەو ڕادەی ڕۆشنبیری مرۆڤ . زۆر ئاساییی‌یە کە جۆری حەزو چێژی منداڵ لەگەڵ گەورەدا جیاوازترە ، ڕەنگی زەوق ئاڵو واڵ زیاتر سەرنجی منداڵ ڕادەکێشێت . ئەمە لەکاتێکدا کەحەزیشی بەپێی تەمەنی دەگۆڕێت دەبینین لەکۆرپەییدا شیری دایکی دەخوات دوای ماوەیەك شەکراوو دوایی چای سارد دەخواتەوە تاگەوەربوونی کەدەیکاتە چای گەرمو قاوەوبیرەو ساردەکە فرامۆش دەکات .

بەوجۆرە حەز وتام کردن لەتەمەندا ڕەنگ دەداتەوەو تۆبوگرافی ناوچەیش حوکم دەکات لەزۆر حەزکردندا ، دەبینین لەلای خۆمان بەهۆی جوانی ناوچەکەمانەوەو سروشتی ڕەنگاو ڕەنگی شوێنەکەمانەوە خەڵکی زیاتر حەز بەڕەنگی ئاڵو واڵ دەکەن ، بەتایبەتی ئافرەتمان کەهەمیشە شەیدای جوانین ، بەڵام لەناوچەی بیاباندا دەبینین ڕەنگی خۆر زیاتر کاریگەرترە ، زۆر جار ڕەنگی جلو بەرگیان لەبەینی زەردو نارنجییدا دەبێت هەست کردنی جوانی لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە دەگۆڕێت زەوقی یۆنانیە کۆنەکان یاخود ڕۆمانیەکان لەزەوقی



ئەمرۆدا دەگۆڕێتو جیاوازترە ، تەنانەت سەنگی جوانیش دەگۆڕێت ، ئەو جلو بەرگەی میللەتی کوردمان ئەمرۆ لەبەری دەکات تارادەیەکیکەم جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوەی کە پێش پەنجا ساڵ یاخود شەست ساڵ لەبەری دەکرد . وەکو دەردەکەوێت هەموو شێوەو ناوەڕۆکێك بەرلێشاوی گۆران دەکەوێتو مێژووش دەوری باڵا دەگێرێت لەو گۆرانکاریەدا (سیگمۆند فرۆید) بۆ دەربڕینی بیرو باوەڕەکانی پەنا دەباتە بەر سێکس بەجۆرێکی والێکی دەداتەوە کە دەوری سەرەکی لەهەموو هەڵسو کەوتێكو ، بیرکردنەوەیەکدا کەمرۆڤ پێی هەڵدەستێ سێکسە . تەنانەت لەحوکمەکەیدا منالی شیرە خۆرەی لەیاد نەکردوەو حوکمی ئەوەدەدات کەمنداڵیش مانای سێکس دەزانێت ، هەروەها هەموو جۆرە شەڕو شۆڕێكو ئاشتیەك بۆ هۆیەك دەگەڕێنێتەوە ئەویش سێکسە ! بێ ئەوەی هیچ بایەخێك بە ئابووریو دارایی بداتو ئاوڕێکی لێبداتەوە . وای دەداتە قەڵەم (جوانیو هەست بزوێنی دوو بابەتن لە سیفەتەکانی جنسی) (٤)

لەوبارەیەوە دەڵێت (جوانی هیچ سودێکی نیی‌یە وەهیچ پێویستیەکی نیی‌یە بۆ مەبەستە ڕۆشنبیریەکان) (٥) ، فرۆید لەبیری

دەچێت یاخود خۆی هەڵە دەکات و لەبیری خۆی دەباتەوە ، کەهەست کردن بەجوانی پێویستیەکی بنەرەتی یە بۆ بەرەو پێشەوە چوونی بیرو هۆشی مرۆڤ تالێکدانەوەی وورد بێت و بتوانێت چاکەو خراپە لێك جیابکاتەوەو هەڵیان سەنگێنێ .

لەهەموو سەردەمێکدا شاعیران و نووسەران و هونەرمەندان دێوانەی جوانی بوونەو بەشانوباهوی‌دا هەڵیان داوە . ئەم هەوڵەی فرۆید بەشتێکی نارەواو نەنگی دادەنێ .

ئەوەی گومانی تێدا نی‌یە وەکو لەوەو پێش باسمان کرد لەهەموو چەرخ و سەدەیەکدا پێوانەیەکی تایبەتی هەبووە بۆ هەڵسەنگاندنی جوانی بۆیە لەبەرهەمی هونەرمەندەکانیش گۆران هەبووە جوانی و چێژی جوانی بەپێی لایەنگیری چینایەتی دەگۆرێت ، چیرنشفسکی‌ی رەخنەگری رووسی جوانی شی دەکاتەوە لەسەردەمی سیزەرەکان بەپێی جیاوازی چینایەتی ودەڵێت (خەڵکی لادێ دەروانە شۆخ و شەنگی نێو کۆمەڵ کەجوانی تێدا نی‌یە بەڵکو لێشی بێزار دەبن چونکە راهاتوون کە (لاوازی) وەك ئاکامێکی نەخۆشی یاخود (ناساخی) لێك بدەنەوە ئیش کردن دەرفەت بەقەڵەوی نادات بۆیە گەربێت و کچە جووتیارێك قەڵەوبێت وەك نەخوشێك سەیری دەکەن ودەڵێن ئەوە (لپرنە) وەخەڵکی سەیری پری دەکەن وەك کەم و کورتیەك ، نابێت شۆخی گوند دوو دەست و دوو پێ‌ی بچووکی هەبێت لەبەرئەوەی ئیشێکی سەخت دەکات بۆیە لەگۆرانیە میللەکانماندا ئەم سیفەتانە نین ، بەکورتی لەوەسفی جوانی‌ی ئافرەت‌دا نابینیت لەگۆرانیە میللەکانماندا سیفەتێك بۆ جوانی و تەندروستی تەواو دەرنەبرن . هەموو جوانیەك لەئەنجامی ژیانی رێك و پێك و ئیشی بەردەوامی دێتە کایەوە ، بەلام بەبێ خۆ ماندووکردنێکی زۆر .

شۆخی نێو کۆمەڵ زۆر جیاوازە ، پێشووناعمان گەلێ وەچە ژیانیان بەبێ ئیشێکی لەشی زۆر بردۆتە سەر . لەگەڵ ژیانی تەمەڵیدا بۆ پەل و پۆی مرۆڤ خوێنێکی کەم دەروات ، بەوجۆرە لەگەڵ هەموو وەچەیەکدا ماسولکەکانی دەست و پێ لاواز دەبن و ئێسکەکان باریکتر دەبنەوە ، ئەمانەیش دەبنە هۆی ئەوەی دەست و پێ بچوك بن و ناشرین بن ، بەلام ئەگەر جوانێکی شار دوو دەست و دوو پێ‌ی گەورەی هەبێت ئەوە بەکەم و کوری دادەنرێ یاخود وەکو نیشانەیەك کەلەبنەماڵەیەکی خانەدان نەهاتبێتە خواری . . . .) [٦]

گەر بێت و ئاورێك لەکۆمەڵگای دەرەبەگایەتی پێشووی خۆمان بدەینەوە چەند پێوانەیەکی جۆراو جۆرمان بەرچاو دەکەوێت جوانیان پێ‌هەڵدەسەنگاند . بەهۆی خۆشی وئارامی ژیانی دەرەبەگەکانەوە زۆر جار وورگ زل و قەڵەو و روومەت سوور سمێڵ فش بوون ، ئەم جۆرە رووخسارە شیان بەجوانی لێك دەدایەوە جووتیارو رەنجبەرەکانیش بەهۆی بێ‌گاری کاروباری چری رۆژانەیان هەردەم لاوازو باریك و رووتەڵە رەق هەڵاتوبوون بۆ ئەم سیمایانە وەك دیاردەی ناشرین دەدرایە قەڵەم ، بەرادەیەك وای لێ هاتبوو گەر ژنە جووتیارێك بهاتبایە جل و بەرگێکی هاوشێوەی جل و بەرگی ژنە ئاغاکەیا بکردبایا ، بەزووترین کات دەدەرایە بەرلێزمەی جنێوو شەق دوایشدا لەبەریان دەدراند ، بەو بیانووەی کەشایەتەی ئەو جۆرە بەرگە نین و لێ‌وەشاوەی ئەوە نین ، یاخود بۆ ئەوە ئەچوون کەئەم شتە مانای چەسپاندنی کەسیایەتیان دەگەیەنێت .

هەردەم بە جوان دەووترا بەگ زادەو شێخ زادەو سەی‌زادە لەلای چینی ژێرەوەیش کەمەرە باریك ، رەمزی جوانی بووە وەك لەم هەڵبەستە فۆلکلۆریەدا دەردەکەوێت :

خەساری کرد شل‌ومل
ناو قەد باریکی چاو بەکل
عەمری نەمێنێ ئاغای گول
(ق . . .) قەویلەی پێ ئەستوور

بێگومان راستی ودروستی و جوانی نیسبین و موتڵەق نین ولەگۆراندان ، بەلام نابێت ئەوە پشت گوێ بخرێت لەهەموو قۆناخ و شوێن و کاتێکی تایبەتی‌دا چەند پێوانەیەك هەن لەراستی‌یەوە نزیك دەبنەوە زیاتر لەچەند پێوانەی سەنگاندنێکی‌تر . بۆیە ئەو پێوانە نیسبیانەی کەلەراستی‌یەوە نزیك دەبنەوە دەبنە پاڵ پشتی چەند پێوانەیەکی نیسبی راستی کەدوا بەدوای خۆیان دێن بەم شێوەیەش یاسای پەرەسەندن دەرواتە رێوە بەپێچەوانەی ویست و خواستی کۆنەو یستان کەدەروانە هەموو شتێك وەك گۆمێکی مەنگی بێ‌جووڵە . بەلام ئێمە کەیاسای نیسبیان سەلماندو بروامان پێ‌هێنا مانای ئەوە نییە هەموو داب و دەستوورو نەریتێك پووچەڵ بکەینەوە بەدرۆ دەلەسەیان بزانین . حوکمی ئەوە بدەین کەمرۆڤ سەربەستە لەهەموو حەزو نەزێکیاو گرنگ نی‌یە لەپێناوی بەرژەوەندیدا بەهەموو کارێك هەڵسێت جاکارەکە خراپ بێت ، یان باش ئەمە ئەو پەری مانای هەل پەرستی‌یە بەو واتایەی کەمرۆڤ بۆی هەیە بەهەموو بابەك شەن بکات هەروەها نیسبیەت ئەوەش ناگەیەنێت کەمرۆڤ پێ‌ی لەزەوی بچەقێنێت و خۆی لەهەموو گۆرانێك و پێش کەوتنێك بێ‌بەری بکات ، هەروەکو ئەو پیاوەی

لێیان پرسی تەمەنت چەندە ؟ لەوەڵامدا ووتی چل ساڵ پاش تێپەڕبوونی دەساڵ هەمان وەڵامی دانەوە ! وەڵامی کابرا زۆر سەرسورهێنەرە بەڵام کابرا پیی ووتن کەمرۆڤ دەبێت هەر خاوەن قسەو هەڵوێستی خۆی بێت . لەهەموو دەمێکدا لای مرۆڤ نەگۆڕی هەڵوێستی پەسەند بووە کوردیش زوو وتویەتی (مرۆڤ دەبێت یەك ڕەنگ‌و یەك دین بێت) یان مرۆڤی نەسرەوتی بەچێشتی نیسك شوبهانووە کەسەرو ژێری بۆ نی یە . (وەلیام شەکسبیر) شاعیری مەزنی ئینگلیزی لەشانۆگەری (ڕۆمیۆ جۆلێت)دا ئەم شتەی دەست نیشان کردووە :-

ڕۆمیۆ : بەو مانگەی ، کەلەلوتکەکان ولق‌و پۆی بەرهەمی ئەم دارەی ڕۆشن کردۆتەوە ، سوێندت بۆ دەخۆم کەمن . . .

جۆلێت : (قسەکەی دەبڕێت) نەخێر . بەمانگ سوێند مەخۆ ، چونکە بێ سرەوت‌و بێ ئارامگەیە ، بەڵکو هەردەم دەگۆڕێت‌و خڕ دەبێ‌و وون دەبێت . با خۆشەویستیشت وەك ئەو نەبێت .

ڕۆمیۆ : بەچ شتێك سوێندت بۆ بخۆم ؟

جۆلێت : پێویست بەسوێند خواردن ناکات ، هەرگیز سوێند مەخۆ ، یاخود سوێند بە ژیانت بخۆ ، سوێند بەکەسایەتی‌ی پیرۆز بخۆ کەهەردەم کڕنووشی بۆدەبەم من بڕوام بەو سوێندە هەیە .)(٧)

لەسەردەمی کۆندا دیل بگیرایا دەکوژرا بەڵام لەدوایی‌دا ئەم شێوازە گۆڕا ، دیلیان وەکو کۆیلە بەکار دەهێناو وەکو هێزێکی کارکردن‌و بەرهەم هێنان دەخرایەکار ، تەنانەت فەیلەسوفێکی وەکو ئەفلاتوون کۆیلایەتی بەشتێکی ئاسایی دادەنێ ، یاخود (ئەرستۆ)ی فەیلەسوف دەڵێت : خودا دوو جۆرە مرۆڤی دروست کردووە ، یەکەمیان عەقڵ‌و ویستی پێ بەخشیوە کەئەویش یۆنانین بۆئەوەی ببن بەنوێنەر لەسەر ڕووی زەوی ودەسەڵات بەسەر خەڵکی کەدا بگرن ، وەدووەم جۆریش ئەوانەن کەخودا هێزی لەش‌و ماسولکەی توندتۆڵ بەولاوە هیچی تری پێ نەبەخشیون ئەم جۆرەیش بریتی لەبەربەریەکان کەلەڕەگەزی یۆنانی نین ، خوایش بۆیە بەشێوەیەکی ناتەواو دروستی کردون تابینە کۆیلەو ژێر دەستەی جۆری سەرپشك‌و پاڵێوراو .

بەهەموو شێوەیەکیش پێویستە لەسەر یۆنانیەکان ئەم جۆرە مرۆڤە بخەنە ئەو خانەیەی کەبۆیان دەست نیشان کراوە کە ئەویش خانەی کۆیلایەتی یە(٨) . پاش ئەم سەردەمەیەش هەندێك لەئاینەکان کۆیلایەتیان وەك شتێکی ئاسایی دەدایە قەڵەم‌و کۆیلەیان بەنیو مرۆڤ دادەنا . . . بەڵام ئەم سەردەمەی ئێمە کۆیلایەتی نەك وەك شتێکی نائاسایی دادەنرێت بەڵکو وەکو کارێکی دژواری شارستانیەت‌و نامرۆڤایەتی سەیری دەکرێت‌و یاسای کۆیلایەتی بە هەموو جۆرێکەوە بەربەرەکانی دەکرێت .

بەڵام کۆیلایەتی لای ڕژێمە بۆرژواکان‌و ئیمپریالیستەکانەوە ماوەو پەرەی پێ دەدەن ، بەڵام دواڕۆژ ئەرکی لەناوبردنی ئەو دیاردەیە دەگرێتە ئەستۆی خۆی دوای تێکشکاندنی هێزی ئیمپریالیزم‌و سەرمایەدار .

پەراوێزەکا

١ - الواقعية في الفن ، سيدني فنكلشتاين ، وەرگێڕانی مجاهد عبدالمنعم مجاهد ، الهيئة المصرية العامة للتأليف والنشر ، ١٩٧١ ، ل ٢١٨

٢ - نقد علم الاجتماع البرجوازي المعاصر ، س .ی پۆپۆڤ ، وەرگێڕانی نزار عيون السود ،دار دمشق للطباعة والنشر ١٩٧٣ . ل ٣٢ .

٣ - الادبوالفن في الاشتراكية ، جان ڤرڤيل ، وەرگێڕانی د .عبدالمنعم الحفني مكتبة مدبولي ، ل ٣٣ .

٤ - الحرب والحضارة والحب والموت ، سيگمۆند فرۆيد ، وەرگێڕانی د .عبدالمعم الحفني مكتبة مدبولی ل ٧٠

٥ - هەمان سەرچاوەو لاپەڕەی پێشوو .

٦ - تطور النظرة الواحدية الى التاريخ ، نووسینی ج . بليخانوف ، وەرگێڕانی محمد مستجير مصطفى ، دار الكاتب العربي للطباعة والنشر بالقاهرة ، ١٩٦٩ ، ل ١١٧٧

٧ - مسرحية روميو وجوليت ، وليام شەكسپير ، وەرگێڕانی غازي جمال ، مكتبة الثقافة العربية ، ل ٥٩ .

٨ - الأدب اليوناني القديم ، نووسینی د . علي عبدالواحد وافي . دار المعارف بمصر ١٩٦٠ ، ل ٣٣ .

## چەند ووشەیەك

بایەخدان بە فۆلکلورو کەلەپووری نەتەوەییمان یەکێکە لەو ئەرکانەی گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ) گرتوویەتی‌یە سەرشانی‌و هەر ژمارەیەی بەپێی توانا نموونەیەکی لی‌بڵاودەکاتەوە . . لەم رووەشەوە هەمیشە داوا لە نووسەرانی بەڕێزمان دەکەین کە دەستی یاریدەمان بۆ درێژکەن .

لەلایەکی تریشەوە . ئەم جارە کە ئەم ووتارە بڵاودەکەینەوە دەبێ خوێنەرانی بەڕێز ووریا بکەینەوە کە ئەم دەرمانانە لە رووی زانستەوە ساغ نەکراونەتەوەو بەکارهێنانیان بەبێ پرسی پزیشك‌و دەزگاکانی تەندروستی لە مەترسی بەدەرنی‌یە . هەروەکو بڵاوکردنەوەی ئەم جۆرە زانیاری‌یە کەلەپووریانەش لەکەڵك بەدەر نی‌یە .

«رۆشنبیری نوێ»

# دروست‌بوونی دەرمانی کوردەواری‌و بەکارهێنانی

نووسین : فەرهاد گۆمەشینی

١ – بۆ (سووتان) : –

بۆ سووتان زۆر دەرمانیان دروست کردووە ، یەکێك لەمانە : --

ئەم دەرمانە بوو : – ئێسکی مریشکیان ئەبرژاند یان ئەسووتاندو بە باشی ئەیانهاری . پاشان هەندێك جۆشیان ئەسوتاندو ئەیانهاری تا وەکو تۆزی لێ ئەهات . ئەنجا هەردووکیان تێکەڵی بەك ئەکردو ئەیانخستە سەر برینەکە .

ئەم دەرمانە وەنەبێ هەر بۆ سووتان بە کاریان هێنا بێ . بەڵکو بۆ زۆر نەخۆشی تریش بە کاریان دەهێنا . وەکو کەچەڵی‌و قینجکەو قار) .

٢ بۆ (دووپشك پێوەدان) : –

بۆ ئەم نەخۆش‌بە شیری هەنجیرو نەفتیان بە کارئەهێنا ، ئەو شوێنەی کە دوو پشکی پێوە ئەدا هەندێك شیری هەنجیریان ئەخستە سەر یان هەندێك نەفتیان ئی‌دا ئەکرد ئەگەر نەخۆشی‌یەکە چاکش نەبوایەوە ! ؟ ئێشی نەدەما ، نەخۆشەکە رزگاری ئەبوو لە ئێش‌و ئازار .

٣ بۆ (سەر ئیشان) یان (ژانە سەر)

بۆ ئەم نەخۆش‌یەش خەنەو پونگپان بە کار ئەهێنا ، هەندێك خەنەو پونگیان تێکەڵی یەك ئەکردو باش ئەیان کولاند ، جا ئەیانخستە سەری نەخۆشەکە ، هەر وەها گیا رەشکێشە بۆ ناخۆشەکە لەگەڵ خەنە تێکەلەیان ئەکردو بۆ هەمان مەبەست بەکاریان ئەهێنا .

٤ بۆ نەخۆشی (شەوکۆری ، چاوکولی)

بۆ ئەم دوو نەخۆشی‌یە (حەوت دەرمانە) یان بۆ بە کار ئەهێنا دروست بوونی (حەوت دەرمانە) لەمانەی لە خوارەوە پێك ئەهات : (مازیی شین ، گەنم ، جۆ ، تۆ بێستان ، سۆتکە . پەلکە لیمۆ ، قەنەفر . شەب) هتد . .

سەرەتا (سۆتکە ، قەنەفر ، پەلکە لیمۆ) ئەمانە بە رێگایەکی پاکو خاوێن بە هیشکی ئەیانکوتان . تا هوورد هوورد ئەبوون (جۆ . گەنم . تۆبیستان ، مازی شین) ئەمانەش پاش پاك کردنەوەیان ئەیابرژاندن . ئەنجا لەگەڵ ئەمەکانی سەرەوە تێکەڵی یەکیان ئەکردن‌و ئەیانکوتان تاوەکو تۆزیان لێئەکردن جا بە رێگای (کلدان وکلچوك) بەکاریان ئەهێنا بۆ شەوکۆری‌و چاوکولی (شەب) بەکەمی‌ی تێی ئەکرێ لای ئەمانی تر ، ئەگەر تێشی دا نەبێ قەیناکا وە نەبێ حەوت دەرمانە هەر لە حەوت شت پێك بێ بەڵکو جار وایە دەگاتە (٥) (شتی جۆراو جۆر .

٥ - بۆ نەخۆسیی (قورباقە) :

ئەم نەخۆشی‌یە کە تووشی مرۆڤ ئەبوو زمانی نەخۆشەکە ئەگیرا هیچ قسەی بۆ نە دەکرا ئەگەر پێویستایە داوای شتێ بکا ئەبوایە وەك کەرو لاڵ بە ئیشارەت قسە بکا . بۆ ئەم نەخۆشی‌یە هێلکەو رۆنیان بە کار ئەهێنا سەری نەخۆشەکەیان ئەناشی‌و هەندێك هێلکەو روونیان لە تۆق سەری ئەدا تا زمانی ئەبۆوە .

٦ - بۆنەخۆشیی (تیراوە) :

بۆ ئەم نەخۆشی‌یە (گۆشتی خاوی زێژکیان) بە کار ئەهێنا ئەمەش بەم شێوەیە بە کار ئەهات :-

هەندێك گۆشتی زێژکیان ئەهێناو بە خاوی ئەیان خستە سەر برینەکە تا ئەو کرمانەی لە ناو برینەکە هەموویان بە گۆشتی زێژکەکەوە ئەنوسان . ئەنجا گۆشتەکەیان فڕێ ئەداو دوایی قەنەفریان ئەهێنا باش باش ئەیان کوتا تاوەکوو توزی لێ ئەهات ئەنجا بە کلچووك قەنەفرەکەیان لە ناو برینەکە ئەدا ئەوجا ئەیانبەست‌و بەم شێوەیە برینەکە بەرەو ووشك بوون‌و چاكبوونەوە ئەچوو .

٧ نەخۆشیی (زگك ئێشان) :

ئەم نەخۆشییە ئەم گیاو گوڵانەی بۆ بە کار دێ (سوسن ، بەیبون ، جاترە ، هند . . .) ئەمانەش هەریەك بە تەنێ یان دووانیان پێکەوە وەك چایە ئەیانکوڵێن‌و دەرخواردی نەخۆشی ئەدەن ، ئەمەش بە شێوەیەکی پاك‌و خاوێن بە کار ئەهات .

پەراوێزەکان : -

١ - حەوت دەرمانە ، دەرمانێکی بە ناو بانگی کوردەواری‌یە بۆ چاو کوێ‌و شەو کوێری‌و هند ، لەم بارەیەوە یەکێك کە خۆی تووشی شەو کوێری ببوو ، بۆی گێرامەوە کە حەوت دەرمانەم بە کار هێنا ، یەکەم جار چاك بوومەوە .

٢ - قورباقە ، ناوی نەخۆشی‌یەکی‌کوردەواری‌یە کەمانای (زمانی گیران) ئەگەیەنێ .

٣ - گیای رەشکیشە یان رەشکێشوکە . ئەم گیایە لە دەم ئاودا شین ئەبێ لە زۆر شوێنی کوردوستاندا .

٤ - تیراوە - بەو شوێنە برینانە دەڵێن کە تووشی کرم هێنان ئەبن یان کرمی ئەبن .

٦ جاترە ، ئەم گیایە لە ناو زۆر شێوی کوردەواریش بە کاردێ وەك کفتە ، چەلاوو نۆك) .

٧ سۆتکە ، ئەمەش لە ناو وەردان هەیە . .

## «یانەی رۆشنبیران»

### ئامادە کردنی : هیـــوا

سلاوو رێزی دەزگاکەمان‌و گۆڤاری « رۆشنبیری نوێ » پێشکەش بە ئێوەی خۆشەویست بێت ، بۆ خزمەتکردنی گەلەکەمان ، گەلی کوردی نەبەز ، هەردەم لە تێکۆشان‌و بەردەوام‌بووندابن‌و بۆ پەرەپێدان‌و پێشکەوتنی رۆشنبیری کوردی بە شێوەیەکی دیار ، لە جیهانی گەشاوەی هونەری گەلان .

خوێندەواری بەرێزو قوتابی خۆشەویست :

گۆڤاری‌رۆشنبیری‌نوێ لە دەزگاکەمان تەرخانکراوە بۆ بەرهەمی زانیاری‌و زمانەوانی‌و ئابووری‌و مێژوویی‌و فەلسەفەو کەلەپووری‌کوردەواری‌و رۆشنبیری‌گشتی ، بۆیە تکاتان لێ‌ئەکەین ئەوەی بابەتی شیعرو چیرۆکە ، بۆ‌گۆڤاری «بەیان» یا بۆ رۆژنامەی «هاوکاری» بنێرن ، کە بۆ ئەم جۆرە بەرهەمانە تەرخانکراون ، ئیتر پێکەوە ئارەق‌برێژین‌و شەونخونی بکەین ، بۆ بەرزکردنەوەی رۆشنبیری کوردی ئێمە زۆر زۆر حەزئەکەین‌و چاوەروانی نامەی بە نرخی ئێوەین‌و هیواداریـن خۆتان ماندوو بکەن‌و شتی‌نوێ‌و کۆنینەی کەلەپووری بە تامی کوردی شاراوەمان بۆ رەوانەبکەن ، بەمە خزمەتێکی گەورەی گەلەکەتان ئەکەن . تکایە نامەکانتان بە شێوەیەکی جوان‌و دیار نوسرابێتەوەو لەیەك رووی‌کاغەزەکە بنوسن‌و ناونیشانی خۆتان بنوسن‌و تاکو بەرهەمەکەتان بە جوانی بچێتە بەردەمی خوێندەوارانی کوردی دلسۆزو ، سەرکەوتووبن .

● بەرێز سەرباز مەجید خۆشناو لە شەقلاوە : پارچە شیعرەکەت (ئاگامان لە گریی مندالانی مەهابادە) پەسندو جوانە ، گریانی مندالانی کورد بە تایبەتی لە ترسی فرۆکەو تۆپ جەرگی مرۆڤ دێنێتەژان ، تەنها توانیمان ئەم دوو برگەیە لە شیعرە ناسکەکەت بلاوبکەینەوە :-

ئەی منالە

لاوازەکەی مهابادم
بۆچی دەگری و
خەوت نایە ؟
بەسرینەوەی ئەستێرەیەك
رۆژ دانایە ! !

* * * * *

خۆت رابێنە لە شەوی درێژ
ئەی پاڵەوان
ئەی بەچکە شێر
بە کوژانەوەی گلۆپێ
تاریك دانایە ! !

● بەرێز کاك موستەفا یەعقوب : نامە خنجیلانەکەت گەیشت و ئەبێ ببوری ئەو باسەی کە لەسەر (ئافرەت)ت نووسیوە . ناوەرۆکەکەی لاوازەو بە خەتێکی جوان نەنوسراوەو لەسەر هەردوولای کاغەزەکەت نووسیوە . چاوەرێی نامەی‌ترت ئەکەین و لە نامەکەت دەرئەکەوێ کە چەند حەزت لە پێشکەوتنی کۆمەڵەو کەئافرەت بنچینەیەتی . هیوای سەرکەووتوویت بۆ ئەخوازین .

● بەرێز کاك ئەحمەد موحەممەد رەسوڵ : ووتارەکەك دەربارەی (شاعیری ناسراو سەعدی شیرازی) خراپ نیە . بەڵام لەبەر خاتری تۆی ئەدەب‌دۆست پەندێکی سەعدی شیرازی بچووك لە نوسیناو گەورە لە ماناکەیدا بڵاوئەکەینەوە . (هەرکەس) رەنگ‌و رووی جوان‌بێت . مەرج نیە خوورەوشتی چاك بێت . خوورەوشت دڵ ئەبکات نەوەك جوانی) .

بەیەك رۆژ ناسین رەنگی‌پیاو دیارە
لە پایەی زانین . هەتا کوێ سوارە

بەڵام شاررراوە دڵی پیسی ئەو
بۆت مەعلوم نابێ . بە چەند رۆژو شەو

● کاك نەجم الدین غەفور فارس لە چەمچەماڵ : (بێسارانی) شاعیر دیوانێکی چاپکراوی هەیە . بەداخەوە دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی دەست‌ناکەوێت

● بەرێزان کاك نەجات خۆشناو وکاك ئەحمەد سابیر کەریم کاك عەبدول‌سەتار نائومێد لە هەولێر : پارچە شیعرە جوانە خۆشەکانتان دامان بە رۆژنامەی (هاوکاری) وسوپاستان ئەکەین .

● بەرێز کاك دلشاد حەسەن لە کارگەی جگەرەی سلێمانی : سوپاس بۆ تۆو نامە جوانەکەت . انشاءالله ئەوەی کوردە دریغی ناکات لە پێش‌کەوتن‌و پەرەپێدانی گەلەکەی لە رۆشنبیری‌و کەلەپووری کوردی براگیان ئەو پەرتووکانەی کە داوات کردبوو . گەر هەشمان‌بێت ئەوا هی کتێبخانەن . داوای لێبووردنت لێ‌ئەکەین‌و تکایە لە هاوری‌کانت وەربگرە سوودیان لێ‌وەربگریت .

● بەرێز کاك رەشید هەمزە عەلی لە قوتابخانەی رزگاری کوران لە هەولێر : بەسەر چاو ئەوا بوویت بە هاوری گۆڤارەکان . داوات لێ‌ئەکەین کەنامەو ووتاری خۆش و بەسوودمان بۆ بنێری‌و چاوەرێ بەرهەمەکانت ئەکەین تا ووشەی کوردی وەك خۆت ئەڵێی : (وەك زێر بریقەدار بن) . سوپاست ئەکەین .

● بەرێز لوقمان عەبدولرەحمان ئامۆژگاری هونەرەجوانەکان لە سلێمانی : ووتارەکەت (لەگەڵ هنەری مۆردا) خراپ‌نیە . گۆرینەکەی رەوان‌نیەو ببوورە لە بڵاوکردنەوەی . چاوەرێی بەرهەمی ترت ئەکەین . کە بۆنی هونەری کوردەواری لێ‌بێت‌و سەرکەوتوو بیت لە ژیان .

● بەرێز کاك قادر میرخان لە سلێمانی : - لێکۆلینەوەکەت (گەشتێك بە ناو پێشانگێ چوار قولیەکەدا) زۆر جوان‌و رەوایە . بەڵام خۆت ئەزانی ماوەیەکی زۆرە بەسەر ئەم پێشانگیە تێپەریوە . خۆزگە زوو بتناردبا بۆ «هاوکاری» . چونکە خۆت‌ئەزانی «رۆشنبیری نوێ» دووجار دەرئەچێ .

● بەرێز کاکە شێخ محمد باڵەك‌و کاك تاهیر عوسمان موحەممەد لە هەولێر :

ئەبێ ببوورن لەبەر ئەوەی کاتێکی زۆر بەسەر شانۆگەریەکەدا تێپەریوە . کاتێ کە رەخنە ئەگرن یا باسی شانۆگەرێك ئەکەن تکایە زوو بینێرن بۆ (هاوکاری) تاکو بڵاوبکرێتەوە لەو کاتەی شانۆگەری‌یەکە . بەردەوام پێشکەش ئەکرێت تاکو هەموویان سوودی لێ‌ببینن‌و بەتایبەتی ئەو کەسانەی کە بەشدارن لە شانۆگەری‌یەکەو ئیتر چاوەرێی

بەرهەمی دەستو خامە رەنگینەکانتانینو سەرکەوتووبن .

● کاك عەزیز موحەمەد لە عەربەت تانجەرۆ لە سلێمان : ووتارەکەت (شیوی شاعیرانی کورد) بۆ بلاوکردنەوە ناشێت . چونکە بیرەکەی تۆزێك لاوازەو زیاتر خۆت بە خوێندنەوەی پەرتووکی ئەدەبی هەمەجۆر خەریك بکەو تکات لی ئەکەین لە نامەرەنگینەکانت بێبەشمان مەکە .

● بەرێزان نەجات گەردیو کاك عەبدولمەجید عبدالرحمنو کاك کمال رەئووفو کاك موحەمەد عەبدوڵلاو کاك فرمان عەبدولعەزیزو کاك جەلال قادر ئەبێ ببورن لە بلاوکردنەوەی بەرهەمەکانتان . چونکە دەست خەتەکەتان جوان نیەو ووتارەکانتان دەستکاری یەکی زۆری ئەوێو تووشی سەرئێشەمان ئەکاتو تکایە نامەی بەسوودو خۆشمان بۆ بنێرنو سوپاستان ئەکەین .

● بەرێز ناظم فاضل لە گوندی سەربیر : سوپاس بۆ تۆو نامە جوانەکەت . برێگیان ئەتوانی لەسەر هەموو شتێك بنوسی کە سوودی هەبێت . تکایە هەرچی پەرتووکێکی دەربارەی کوردو زمانیو رۆشنبیری کوردی نووسراوە بیخوێنەوە .

● بەرێز کاك تاهیر عوسمان موحەمەد لە هەولێر : ووتارەکەت (میکرۆب چۆن دۆزرایەوە) ئەووندەمان هەلبژارد : پێش دووسەدوپەنجا سالێ . (لیدنهوك)ی جۆلای هۆلەندەیی لە هاریبی شووشەو دارشتنەمەی بە قەوارەی ئەستوورتر . لە دوای بیست سالێ هەولدان . توانی زەرەبینێك دروست بکات . کە گیانلەبەری زۆر بچووکی گەورە ئەکردو بە چاو ئەبینرا . دوای ئەو (سپالانزای) قەشەی ئیتالی ئەرکی گەشەپێکردنی ئەو داهێنەرەی گرتە ئەستۆو گەیشتە ئەو راستیەی کە ئەو گیان لەبەرانەی کەپێی ئەلێن (میکرۆب) لە ئەنجامی زاووزێ لە نێو خۆیاندا زۆرئەبنو بە خۆراکی ئەو مادەیەی تی کۆئەبنەوە ئەژین .

● بەرێز کاك دلشاد موحەمەد (دی . . ئەی) باسی حەسەن زیرەکی ئەمر ئەکاتو ئەلێت لە سالی ۱۹٦۲ حەسەن زیرەكو موحەمەد جەیرانی هورێی چوونە ناوچەی پێنولەو دەربەندی پێنولە لەوێ لە مالی (تاهیربەگ) مانەوە مەوەی سی رۆژ . خەلکی ناوچەکەی دەوروبەر . دیاری یان بردوە بۆ مالی تاهیربەگو تاکو لەوێش چوین بە حەسەن زیرەك بکەوێتو گوێ راگرن بۆ گۆرانی یەکانی .

سوپاس کاك دلشاد (دی . . ئەی) داوا کرین شتی بە نرختمان بۆ رەوانەبکەی جگە لە (دی . . ئەی) .

● بەرێز خاوەنی وێنەخانەی (الحرية) لە ئاکرێ : زۆر زۆر سوپاس بۆ خۆتو وێنەکانتو کامیراکەت . چاوەروانبە . وێنە جوانەکانی شارە خنجیلانەکەی ئاکرێ رۆژێك بەرگی رۆشنبیری داگیرئەکاتو

## — سینەم —

## رێکێش ئامێدی

ئەڤە سترانەکە ئێکە ژ گەلەك سترانێت سترانبێژێ ب ناڤو دەنگ حەمەکوری (حەمکێ) یێ کو گەلەك ژ ژیێ خو بوراندی لنك پاشایێت ئامێدیێ ئەڤ سترانبێژێ یێ بەڤلو ژێهاتی گەلەك سترانێن ڤەهاندین ب دلداریێو ئەڤیندارا شتی سترانا (شاهینو) و (ئەز چوومە کەلێ) و (من د کەلێرا بەر لێبو) ئو گەلەك سترانێت دی ژبلی ڤان .

ئەڤا ژێری (سینەم) ئێکە ژ سترانێت حەمکێ منا ژ خالد عەزیزی وەرگرتی خەلکێ گوندێ هاجیمەندانە ژێ وی نێزیکی (٤٢) سالایە .

– سینەم –

من سینەم دیت ل ئەیوانێ
یا لاندکێ تژنیت
شەڤ باکێ شەڤێ لێدا
قولپا ل مەمکا دبزدینیت
خزێمەکەکا ل دفنێدا
ب ئاکرێو ئامێدیێ دئینیت
من سینەم دیت ل ئەیوانێ
یا لاندکێ لبا دکەت
شەڤ باکێ شەڤێ لێدا
خێلیێ بەفرو با دکەت
کاتە ژکاتێ دوو تا دکەت
خزێمەکا ل دفنێدا
ئاکرێو ئامێدیێ را دکەت
سینەم درو مراری
یا دنیڤەکا بەحرێدا
ئەزێ چمێ بغەوازی

ئەهلگەك کەفتە درێدا
ئەز تا گەهمە مرادێ
فەلەکێ چەرخەك لێدا
سینەم درو مراری
یا لنیڤەکا رویباری
ئەز داچمێ بغەوازی
فەلەك نەهاتە هاری
سینەم درو مراری
یا کەتیە بەحرا بەلەك
ئەزێ چۆمێ بغەوازی
ل من بەستن گەمیو گەلەك
ئەز داگەهمە مرادێ
ئێقبال چوو ما بو فەلەك
سینەم درو مراری
یا لسەر پەرێ سیمەرخێ
هەمی چوونێ بقیمەتێ

کەس پێ‌نادەتن نەرخێ
ئەز داگەهمە مرادێ
فەلەك زڤری چەرخێ
سینەم ستێرەکا گەشە
یا ل‌ئەسمانێ دونیایێ
هات‌و ژقیبلێ راوەستا
شەفەقێ دا بێلایێ
ئەز دا سینەم راموسم
یا بابێ فاتمایێ
سینەم ستێرەکا گەشە
یا لنیڤەکا ئەسمانی
هات‌و ژقیبلێ راوەستا
شەفەق‌دا دەرێ خانی
ئەزدا سینەم راموسم
ب‌قوەتا سولیمانی
سینەم ستێرەکا گەشە
یا ل‌ئەسمانێ قودرەتێ
هات‌و ژ قیبلێ راوەستا
شەفەق دابو خیڤەتێ
ئەز دا سینەم راموسم
خودێ بدەت فەرسەتێ
سەلتا سینەما رابو
دگەل وەختێ گەلاڤێژێ
دەست دانانە سەر دەستا
حورێ گەردەن درێژێ
ئەز دا سینەم راموسم
هەر دگەل بانگێ نڤێژێ
سەلتا سینەما رابو
دگەل وەختێ ستێرا گەشە
دەست دانانە سەر دەستا
حورێ گەردەن فەرشە
ئەز دێ سینەم راموسم
دگەل بانگێ دیکلێ عەرشە
سەلتا سینەما رابو
دانا دەشتا نهێلێ
دەست‌دانانە سەر دەستا
حوریێ گەردەن کێلێ
ئەز دێ سینەم راموسم
پاشای نادەم ب‌سمبێلێ
سینەم بەحرەکا شینە
بەردا دەشتا هەڤلێرێ
هات رەڤەندێ رەش ئاغا
شەر کەفتە بانیا دێرێ
ئەز دێ سینەم راموسم
هەکە بێت رۆژا خێرێ
سینەم بەرحرەکا شینە
ژ بەردا دەشت‌و دەبانە
هات رەڤەندێ رەش ئاغا
دگەل عەرەب‌و گۆرانا
ئەز دێ سینەم راموسم
یا ژ بەر حوکمێ سولتانا
سینەم یا بوی خەزالەك
پال ئاغایێ پشدەرێ
قەفتا بسکا شور کریە
سەر کولیلکا کەمەرێ
دوو چیکێت ژ مەمکا دکەڤن
وەکی ئاڤا خەوسەرێ
ئەز دا سینەم راموسم
ژبەر حوکمێ ڤێ خەنجەرێ
بیێژنە بابێ سینەمێ
سینەموکا نەخوشە
هوستا بینن ژ (میسرێ)وو
دە چێکەن کێلی‌و فەرشە
مەلا بخینن یاسینێ
مێڤانا قەبرێ رەشە
جابێ بدەن میرێ مارا
دا نەخون خالێت گەشە
بیێژنە بابێ سینەمێ
سینەموکا تاوی‌یە
هوستا بینن ژ (مسرێ)وو
چێکەن فەرش‌و کێلی‌یە
سینەمێ مال ڤەرێکر
دانا بو شینەوارا
روینشت‌و کوفی چێکر
تیتێ پالدا گوهارا
ئەز دێ سینەم راموسم
هەر لبەر بانگێ ئێڤارا
سینەمێ مال ڤەرێکر
دانا بو نانەیێ
روینشتو کوفی چێکر
تیتێ پالدا ئەنیێ
ئەز دا سینەم راموسم
لبەر بانگێ سوبەهیێ
سینەم شێخا مەمانێ
تە ل‌پشتێ شالا رەشە
دپاخلێ جووتێ شەمامێ
لێ‌تێت بێنەکا خوشە
سینەم شێخا مەمانێ
تە ل‌پشتێ شالا شینە
دپاخلێ جووتێ شەمامێ
لێ تێت بێنا شرینە
مەلا بخوینن یاسینێ
ئەو مێڤانا قەبری‌یە
جابێ بدەن میرێت مارا
دەست نەکەن خالێت روی‌یە
سینەم حەودا رحانا
من بو دلکێ خو چاندی
شەڤباکێ شەڤێ لێدا
کاتە ل کاتێ بزداندی
لاندو مندال دزێرینن
یا سینەم تێ هەژاندی .

# ڕێڕەوێکی تایبەتی

جەلال محمود علی

زمان وەك زیندەوەرێکی بالاّ هەمیشە لەگەشەو پەل هاویشتن‌و گەورەبووندایە ، هەر زمانە خاوەنی نیشانەو ڕێڕەوی تایبەتی خۆیەتی ، هەندێك لەوانە بە ڕەسەن لە بنچینەو سەرچاوە سەرەکییەکەیەوە وەری‌گرتووە ، هەمیشە پاش ئەوەی کە لە سەرچاوەکەی پچڕاوە ، بە پێی پێویست و لە ئەنجامی پێشکەوتن‌و شکۆفەی پەیدای کردووەو بۆی داهاتووە .

جا یەکێك لەو ڕێڕەوی جوانکارییانەی کە لە ڕستەی کوردیدا هەیە ئەوەیە ، کە لە ڕوودانی هەندێك فرماندا دەنگێکی تایبەتی

Roshinbiry Nwe
General Cultural Monthly
Magazine
Issued by: Kurdish Culture
and Publication House
Ministry of Culture and
Information
Baghdad - Iraq

رۆشنبیری نوێ
مجلة ثقافية شهرية عامة
تصدر عن : دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام
بغـــداد

رئيس التحرير
مصلح مصطفى الجلالي

ناونیشان : دار الثقافة والنشر الكردية / ساحة الخلاني بغداد
تەلەفون ٨٨٧٥٧٩٥ پێنج خەتە

نرخی ٢٠٠ فلسە

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ١١٢ لسنة ١٩٧٩

مسجلة بدائرة البريد برقم ١١٩

مطبعة الاديب البغدادية هاتف 8881232